

## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە


- **ئەرەستۆ و ژن** (ژن لە فەلسەفەدا) (٢)

- **نووسینی:** د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام
- **وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:** سەرکەوت جەلیل
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **سەرپەرشتی پڕۆژە:** هاوار نەسرەدین
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٣
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- چاپخانەی موکریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٩٤٩) ساڵی ٢٠١٣ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٧٥٥)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

* ئەو وێنەیەی ئەرەستۆ بۆ ژنی داتاشیوە زۆر گرنگە، کاریگەرییەکی زۆریشی هەیە، چونکە لە قوڵاییەکانی کولتووری ڕۆژئاواییدا جێگیربووە، هەر ئەویش بووە بە سەرچاوەی ناسینی ژنان بە شێوەیەکی گشتی.

سوزان بێل

* پیاوی سپی پێستی ئەمەریکی، ڕەش پێست دادەبەزێنێتە ئاستی پاککەرەوەی پێڵاو و پاشان ئەنجامگیریی ئەوە دەکات، کە ڕەش پێست تەنیا بۆ پاککردنەوەی پێڵاو شیاوە.

بێرنارد شۆ

پێشکەشە:

ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە دایکم، کە وەك هەر ژنێکی کورد تەمـەنی خــۆی لـــە خزمـــەتکردنی ئـــەوانی تـــر و فەرامۆشـــکردنی خۆیـــدا گوزەراندووە.

وەرگێڕ

# پێرست

# پێشەکی

ئەگەر ئەفلاتون لە رووی فەلسەفییەوە دۆخــی ژنــی یۆنــانی وەك ئــەوەی هــەبوو کورت کردبێتەوە (باسکردبێت)، ئەوا ئەرەستۆ ئەم دۆخەی کرد بە قانونێــك، کاتێــك هەولێدا تیۆرێك لە ســەر ژن دابنێــت، کــە پایــە ســەرەکییەکانی لــە میتافیزیکــاوە وەرگرتبێت. پاشان بە سەر بایۆلۆژیا و دواتــریش بــە ســەر هەریەکــە لــە ئــەخلاق و رامیاریدا پراکتیکی کرد، ئەمەش بۆ ئەوەی راستی و دروستی ئەو دۆخــە نالــەبارەی ژنان بسەلمێنێت، کە خوو و نەریتە یۆنانییەکان بۆیان دروستکردبوو.

مەترسیی تیۆرەکەی ئەرەستۆ لەوەوە دێت، کە لە دوای خۆی بە شێوەیەکی فراوان لە کولتووری عەرەبی (و کوردیشماندا) دووبارە و دووپاتکرایەوە، رەنگە زەمینەیەکی لە باری بۆ خۆیشی دۆزیبێتــەوە، چــونکە زۆرێــك را و ســەرنجی هاوشــێوەی ئــەوانی ئەرەستۆی تێدابوو، کە تەنیا ئەوەیان مابوو تیــۆریزە بکــرێن. رێــك وەك ئــەوەی لــە کولتووری رۆژاواییدا روویدا، لەم بارەیەشەوە سۆزان بێــڵ دەڵێــت: ((ئــەو وێنەیــەیی ئەرەستۆ بۆ ژنی داتاشیوە زۆر گرنگە، کاریگەرییــەکی زۆریشــی هەیــە، چــونکە لــە قولاییەکانی کولتووری رۆژاواییدا جێگیربووە، هەر ئەویش بووە بە سەرچاوەی ناسینی ژنان بە شێوەیەکی گشتی))[١]. ئەمەش رێك بە سەر کولتووری عەرەبیدا دەچەســپێت. ئەگەر تۆزێك بە وردی سەرنج بدەین، لێرە و لەوێ بیرۆکە و دەستەواژەکانی ئەرەســتۆ دەبینین، سەبارەت بەوەی، کە ژنان زوو هەڵدەچن و توندوتیژن و رەگەزێکی هەستیار و ناسك و سۆزاوین، زوو کاریگەر دەبن، زیاتر پشت بــە هەســتەکان دەبەســتن وەك لــە ئەقڵ، هەر بۆیە کەمتر ئامادەییان تێدایە بۆ سەرۆکایەتیکردن وەك لە پیاوان، چونکە سەرۆکایەتی پێویستی بە ئەقڵە نەك بە هەست[٢].

هەروەها بیرۆکــەکانی ئەرەســتۆ لــە هــەموو لایــەك بــە نێــو کولتوورەکەمانــدا بڵاوبوونەتــەوە، بــە رادەیــەکی وا، کــە بوونەتــە بەشــێکی دانــەبڕاو لــە رۆشــنبیریی

گشتیمان، لای رۆشنبیر و بیرمەند و فەیلەسوفیش دەیانبینی، هەر وەك لای پیاوێکی سەرجادەش دەیانبینی! مرۆڤ سەری دەسوڕمێت کە بیرمەندێکی گەورەی وەکو غەزالی دەبینێت کاتێك پێیوایە ((هاوسەرگیریی جۆرێکە لە کۆیلایەتی، ژن دەبێتە هاودەمی پیاو، لەبەر ئەوەی جۆرێکە لە کۆیلایەتی، کەواتە گوێڕایەڵی پیاوی بە رەهایی لە سەر واجبە لە هەر شتێکدا داوای لێبکات و بۆی نییە سەر پێچی بکات))[٣]. لێرەدا غەزالی هاوبەشیی و سۆز و خۆشەویستی (مودة و رحمة) لە بیر چووە کە لە قورئاندا هاتوون! تەنانەت کار گەیشتوەتە ئەوەی، کە گوێڕایەڵیکردنی مێردیان کردووەتە یەکێك لە بنەماکانی ئیسلام! (( غەزالی چەند فاکتێکی کۆمەڵایەتی باوی باسکردووە کە لە رێز و بایەخی ژن کەم دەکەنەوە، لەمەشدا پشتی بە چەند فەرموودەیەکی دەماودەم (متواتر) بەستووە، کە راستی و دروستی زۆرێکیان جێگەی گومانن))[٤].

هەروەها غەزالی پێیوایە ئامانجی یەکەمی هاوسەرگیریی منداڵە، ئەمەش بنەڕەتە و هەر بۆ ئەمەش هاوسەرگیریی هەیە[٥] ئەم پرۆسەیە لەبەر شەهوەت نییە، بەڵکو شەهوەت رۆڵی مۆتیڤی هەیە، وا لە پیاو دەکات تۆو دەربکات و ژنیش ئامادە دەکات بۆ وەرگرتنی تۆوەکە[٦].

چەندین بیرۆکەی تر هەن بە درێژایی ئەم توێژینەوەیە دووبارە دەبنەوە، خوێنەر لەگەڵیاندا هەست دەکات ئەوەی ئەرەستۆ دەیڵێت نامۆ نییە بە لایەوە، بگرە پیاوی سەرجادەش بە یەقین و متمانەوە هەندێکیان دەڵێتەوە. کێ لە ئێمە نەمانبیستوە گوایە ژن ئاستی زیرەکیی کەمە، ئەقڵی نوقسانە، لە حوکمدانی بە سەر شتەکاندا هاوسەنگ نییە، بۆ سیاسەت یان سەرکردایەتی یاخود بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت شیاو نییە و ...هتد. تەنانەت ئەگەر بێت و چەند نموونەیەکی درەوشاوە لە رۆژهەڵات و رۆژاوا ببینێت، خۆی لێ نەبان دەکات، بێ ئەوەی بە دوای لێکدانەوەیدا بڕوات یان لە خۆی بپرسێت: کە چۆن لەگەڵ بیرکردنەوەیدا وێك دێتەوە؟ (مارگرێت تاتشەر) لە لوتکەی حوکمڕانیدایە لە بەریتانیا، (ئەندێرا گاندی) لە هندستان، (بی نەزیر بوتو)

له پاکستان، هەروەها (گۆڵدا مائیر) له ئیسرائیل، که زوخاوی دونیامان به دەستی چەشت. هەموو ئەمانه بۆ تەنیا جارێك وای لێناکەن له خۆی بپرسێت: ئایا شۆفێری ئۆتۆمبیلەکەی بی نەزیر یان ئەندێرا لەوان ئاقڵتره تەنیا لەبەر ئەوەی ئەو پیاوه و ئەمانیش ژن؟ ئایا ئەو نامەبەر یان پاسەوانەی که لەبەر دەرگاکەیاندا رادەوەستێت، لەوان به تواناتره له بەڕێوەبردنی وڵاتدا، یان له بڕیارداندا لەوان هاوسەنگی زیاتره تەنیا لەبەر ئەوەی ئەو پیاوه و ئەمانیش ژن؟ چ دواکەوتوییەکە...!

ئەرەستۆ تەنیا به باسکردنی ئەم کەموکوڕیانەی ژنەوه نەوەستاوه، بەڵکو هەندێکی تریشی بۆ زیاد کردوون. بەوەی ناتوانێت وەك پیاو فەزیلەتە ئەخلاقییە جیاوازەکان مومارەسه بکات، ناتوانێت هیچ پلەیەکی کۆمەڵایەتی یان رۆشنبیریی هەبێت، تەنانەت بەڕێوەبردنی ماڵیشی بۆ ناچێته سەر، ئەرکی ئەو تەنیا خستنەوەی منداڵه، بەڵکو بەرپرسیاریەتییەکەی کاتێك کامڵ دەبێت، که منداڵی کچی ببێت! ئەمەش بیرۆکەیەکه له رابردوو و له ئێستاشدا له کۆمەڵگای عەرەبیدا زۆر باوه(و له کوردستانی خۆشماندا تا ئێستا خەڵکانێك که منداڵی کوڕیان نابێت، تووشی خەفەت و حەسرەتێکی زۆر دەبن)، له کاتێکدا ئەوه پیاوه بەرپرسه له دیاریکردنی رەگەزی منداڵ[7]، یان دەڵێن سروشت منداڵی کچ ناخاتەوه، تەنیا کاتێك نەبێت، که له ڕێڕەوی دروستی خۆی لا بدات. ئەمانه و چەندین بیرۆکەی ئەرەستۆیی تر، که دوایی نایەن، دەبینی لێره و لەویّ پەرش بوونەتەوه. به داخەوه هەندێکیان بەرگێکی دینییان به بەرداکراوه تا زیاتر به هێز و کاریگەرییان بکەن، خستویانەته سەر ئیسلام، که ژنی عەرەبی له کۆشی نەزانین و دواکەوتوویی دەرهێنا، له کاتێکدا پێشتر لەگەڵ موڵکەکانی تری پیاودا به میراتی دەبرا، ئیسلام بەرزیکردەوه بۆ بەرزترین پلەی کۆمەڵایەتی، ئەو کاتەی کردی به سەرداری خۆی له ماڵ و موڵك و مێرد و ...هتد.

لێرەوه گرنگیی خوێندنەوەی تیۆرەکەی ئەرەستۆ و بەراوردکردنی را و بیرۆکەکانی بەوانەی له کولتوور و کەلەپوری عەرەبی (و کوردی)ماندا له کۆن و ئێستاشدا وتراون، دەردەکەوێت[8].

پێشتر تێبینیی ئەوەمان کرد، ئەو سیفەتانەی ژنانی رۆژهەڵاتیی ئێستایان پێ وەسف دەکرێت [9]، هەمان سیفەتی ژنانی نێو کۆمەڵگای ئەسینایی بوون، لە کاتێکدا ژنی رۆژهەڵاتی لە میسری کۆندا بۆ نموونە، بە چالاکی و بەشداریکردنی لەگەڵ پیاودا لە هەموو روویەکەوە، هیرۆدۆتی مێژونووسی سەرسام کردووە: لەماڵەوە، لە بازرگانی، کشتوکاڵ، بازاڕ و رامیاریدا، تەنانەت توانی بگاتە بەرزترین پلەی سیاسەت، کاتێك بە تەنیا یان لەگەڵ مێردەکەیدا حوکمی وڵاتی دەکرد [10].

دیۆدۆری سەقەلیش دەڵێت: (( ژن لە پادشا دەسەڵات و رێزی زیاتر بوو، ئەمەش لەبەر ئەو یادەوەرییە باشانەیە کە خواوەندە ئیزیس لە میسردا جێیهێشتبوو)) [11] ژن رێزێکی زۆری هەبوو، بە رادەیەك هەموو جار پادشا وێنەی لەگەڵ ژنەکەیدا هەڵدەکۆڵرا، بەڵکو گرانترین سوێندێك لای (ئەخناتۆن) ئەوە بوو سوێند بە هاوسەرەکەی (نەفەرتیتی) بخوات، تەنیا کچیشیان هەبووە، کەچی پادشا ژنی تری نەهێنا تا کوڕی ببێت. ئەمەش تەنیا لای پادشا فیرعەونییەکان یان چینی باڵای نێو کۆمەڵگای میسری وانەبوو، بەڵکو بۆ هەموو توێژەکان وابوو (( ژنان لەگەڵ پیاوەکانیاندا دەهاتن بۆ ئاهەنگە گشتییەکان، ئەمەش شتێکی نامۆیە بە جیهانی کۆن و رۆژهەڵاتی ئێستا، پیاوی میسری بۆ هەرکوێ چووبایە ژنەکەی لەگەڵ دەبوو. ئەدەب نەبوو ژن و مێردێك لە یەکتری جیابکرێنەوە، ژن و مێردی میسری دەست لە ناو دەست ژیان تێدەپەڕێنن، هەروەك لە وێنەی سەر گۆڕەکاندا دەردەکەوێت)) [12].

ئەمەش واتە هەندێك لە کۆمەڵگا رۆژهەڵاتییەکان لە کۆندا، لە کۆمەڵگای یۆنانی شارستانیتر بوون، چونکە یۆنان ژنیان خستبووە دۆخێکی زۆر نالەباری نامرۆییەوە و پیاویشیان کرد بە ئاغا و زاڵ و فەرماندەر و نەهیکەر [13]. ئەم دۆخەش فەلسەفەی ئەفلاتون باسیکردووە و ئەرەستۆش کردوویەتی بە قانون. ئەگەر کۆمەڵگا رۆژاواییەکان توانیبێتیان وردە وردە خۆیان لەم بیرۆکە ئەرەستۆییانە راپسکێنن، ئەوا کۆمەڵگا رۆژهەڵاتییەکان هێشتا پاراستویانن، پێوەی دەژین، وەك بڵێی رزقێك بێت

تەواو نەبێت، لە راستیدا لە کۆمەڵگای پیاوسالاریدا هەروایە، بگرە لەوەش زیاتر، هەوڵیداوە جۆرێك لە پیرۆزیی بەم بیرۆکانە ببەخشێت.

بۆ ئەوەی بتوانین بە قوڵیی لە رەگ و ریشەی ئەم تیۆرە ئەرەستۆییە تێبگەین، کە کاری لە بیرکردنەوەمان کردووە و هێشتاش لە ژیانی کولتووریماندا رابەرایەتیمان دەکات[١٤]. پێویستە لە چەند بیرۆکەیەکی فەلسەفیی بنەڕەتی تێبگەین. بۆیە تەوەری یەکەممان تەرخانە بۆ باسکردنی باکگراوەندی فەلسەفی لە بنیاتنانی تیۆرەکەدا. تیایدا باس لە ئارەزووی زانین بە گشتی و زانینی فەلسەفی بە تایبەتی دەکەین. پاشان پێویستبوو چەند پایەیەکی گرنگ باسبکەین، کە ئەرەستۆ هەڵوێستی خۆی بەوانە بە هێزتر دەکات و لە میتافیزیکاوە وەریگرتوون. دواتر ئەو نموونە پراکتیکییانەی کە پاش پێکهێنانی تیۆرەکەی لە سەر ژن پێیان هەستاوە، بە تایبەتیش لە بواری سیاسەت و ئەخلاقدا. دواتریش با ببینین چۆن بە بایۆلۆژیا، کە ئەوکات ئەرەستۆ گەورەترین زانای ئەو زانستە بووە، پشتگیریی لە هەڵوێستی خۆی دەکات. بەمەش دەگەینە ئەوەی کە ئەرەستۆ هەموو فەلسەفەکەی کردووە بە بیانوویەك بۆ پشتڕاستکردنەوەی تیۆرەکەی.



پێش برینەوەی ئەم پێشەکییە پێویستە بڵێین: ئێمە شتێك لە ژیانی کەسیی ئەرەستۆ نازانین، کە بشێت هۆکاری ئەم رقەی بێت لە بەرامبەری ژناندا، تەنیا ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە بڵێین ئەو، ئەو رقەی لە کۆمەڵگای یۆنانیدا هەبوو بەرامبەر بە ژن، کردی بە قانونێك. ئەرەستۆ دووجار هاوسەرگیریی کردووە، یەکەمیان لەگەڵ پیسیاس خوشکەزای هاوڕێیەکی خۆی بوو، کە پێکەوە لە ئەکادیمیای ئەفلاتون دەیانخوێند ناوی هێرمیس بوو، شتێکی ئەوتۆ لە بارەی ئەم هاوسەرگیرییە نازانین هەر

چەندە هەندێك کەس، لەوانەش تایلۆر، پێیانوایە هاوسەرگیرییەکی سەرکەوتوو بووە[١٥]. ڕەنگە دوو هۆکار وامان لیٚ بکەن ئەم قسەیە بە ڕاست بزانین:

یەکەم: لەم ژنەی کچێکی بووە و بە هەمان ناوی دایکییەوە (پیسیاس) ناویناوە.

دووەم: لە ڕاسپاردەکەیدا داوای کردووە ڕووفاتی ئەم ژنەی بۆ بگوازنەوە (هەرچەندە ماوەیەکی زۆر پێش خۆی مردووە) تا لە گۆڕەکەیدا لەگەڵ خۆیدا بنێژرێت (( لە هەر کوێدا نێژرام، با ڕووفاتی ژنەکەم (پیسیاس) کۆبکرێتەوە و لە گۆڕەکەمدا لەگەڵمدا بنیژرێت، ئەمە خواستی ئەویش بوو))[١٦].

جاری دووەم لەگەڵ ژنێك بە ناوی هێرپلیس هاوسەرگیریی کردووە (ئەو ژنەی دایکی نیکۆماخۆس بوو، کە کتێبی ئەخلاقی پێشکەشکردووە) زیاد لە جارێکیش باسی چاکە و خۆش مەشرەبیی کردووە. داوای لە نیکانۆر، جێبەجێکەری ڕاسپاردەکەی کردووە، لەبەر هەستی هێرپلیس بەرامبەری و وەك یادێکی خۆشی بۆ ئەو، چاوی لێی بێت و ئاگاداریی بکات. ئەگەر دوای خۆی حەزیکرد شوو بکاتەوە، دەبێت نیکانۆر بیداتە پیاوێك کە خراپ نەبێت و لە ئاستی ئەودا بێت. جگە لە بەشە میراتی خۆی، دەبێت هەندێك زیوی زیاتری بداتیٚ، لەگەڵ سیٚ خزمەتکاردا، کە خۆی هەڵیاندەبژێرێت جگە لەو خزمەتکارەی کە بۆ خۆی هەیەتی، پیرهیاس. ئەگەر ویستی لە شاری کالکیس بمێنێتەوە، ماڵەکەم کە لەنێو باخچەکەدایە بۆ ئەو بێت. ئەگەر ویستیشی لە شاری ئیستاگیرا بمێنێتەوە، ماڵەکەی باوکم بۆ ئەو بێت. پێویستە لە سەر جێبەجێکەرانی ئەم ڕاسپاردەیە ئەو خانوەی هەڵیدەبژێرێت، بە تەواوی ناوماڵەی بۆ ببەن و بە باشترین شێوەی گونجاو بۆی ڕابخەن، بەو مەرجەی هێرپلیس خۆی لە سەری ڕازی بێت و خۆشی لێی بێت[١٧].

لەم ڕاسپاردەیەوە کە مێژونووسی فەلسەفەی ئەڵمانی، ڤێرنەر بیگەر لە کتێبەکەیدا (ئەرەستۆ: بنچینەکانی مێژووی گەشەسەندنی) ساڵی ١٩٢٣ بڵاویکردووەتەوە، دەردەکەوێت کە ژیانێکی خێزانیی وا ژیاوە، کە پڕ بووە لە (هەستی مرۆییانە) هەروەکو بیگەر دەڵێت[١٨].

پێویسته ساتێك له سەر ئەم راسپاردەیه راوەستین و چەند تێبینییەکی گرنگ بخەینەڕوو:

**تێبینیی یەکەم:**

دەبێت ئاماژە بدەین بەو ناسکی و وەفا و دڵسۆزییە ئاشکرایەی بۆ هەردوو ژنی یەکەم و دووەمی هەیبووە. ئەمەش خاڵێکە لە بەرژەوەندی مامۆستای یەکەمە و مایەی پێزانینە، ئەو داوا لە جێبەجێکەری راسپاردەکەی دەکات روفاتی ژنی یەکەمی بگوازێتەوە و لەگەڵ خۆیدا بینێژێت، دوای ئەمەش ژنی دووەمی بۆ بە شوو بدات، ئەمەش ئەگەر خۆی ویستی شوو بکاتەوە و پێویستە مێردە تازەکەی پیاوێکی باش بێت.

**تێبینیی دووەم:**

دەرهەق بە پیسیاسی کچی، نەیتوانیوە واز لە خوو و نەریتی هاوولاتی ئاسایی ئەسینایی (واتە پیاوی سەرجادە) بهێنێ. لە راسپاردەکەیدا لە بارەیەوە دەڵێ: (ئەگەر کچەکەم گەیشتە تەمەنی پێگەیشتویی، دەبێ لە نیکانۆری مارە بکەن. ئەگەر کچەکەم پێش شووکردن (خوانەخواستە) بمرێت، یان شوو بکات بەڵام منداڵی نەبێت، ئەوا بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی نیکانۆر و لە سەریەتی کاروباری نیکۆماخۆسی کوڕم وەك پێویست بەڕێوە ببات)[١٩].

لێرەدا دەبینین ئەرەستۆ وازی لەو دەسەڵاتی پیاوسالارییە نەهێناوە، کە پیاوی ئەسینایی هەیبووە، کە تەنیا ئەو دەسەڵاتی بە شوودانی کچی هەیە (تەنانەت بۆ بێوەژنەکەشی هەروایە، ئەوەتا سیفەتەکانی ئەو پیاوەی دیاریکردووە، کە دەبێت شووی پێبکات. هەر وەك پێشتر ئەفلاتون وتوویەتی: خاوەن ماف لە مارەبڕین و بە شوودانی کچدا بە پلەی یەکەم باوکە، ئەگەر باوکیش نەبوو بە پلەی دووەم باپیرە)[٢٠].

**تێبینیی سێیەم:**

ئەرەستۆ داوای ئەوە دەکات کچەکەی بدرێتە پیاوێکی دیاریکراو (نیکانۆر) کە وەختی خۆی باوکی سەرپەرشتیار (وصی)ی ئەرەستۆ بووە، دایکیشی بە شیر دەبێتە دایکی ئەرەستۆ، پێش ماوەیەکی زۆریش مردبوون، ئەو کات ئەرەستۆ کوڕەکەیانی هەڵگرتەوە (تبنی) و بوو بە باوکی. پاشان ئەم کوڕە بوو بە ئەفسەر لە سوپای ئەسکەندەری مەزندا و پێدەچێت کەسێکی نزیك بوو بێت لێیەوە[٢١].

**تێبینیی چوارەم:**

لە راسپاردەکەیدا بەردەوام دەبێت و دەڵێت: ( ئەگەر خوانەخواستە شتێك بە سەر نیکانۆردا بێت پێش ئەوەی کچەکەم شوو بکات، یان پاش شووکردنی بەڵام منداڵی نەبوو بێت، ئەوا ئەو رێکارانەی بڕیاریان لێداوە رەوا و بێ کەموکوڕیی دەبێت، ئەگەر ساوفراستۆس بیەوێت لەگەڵ کچەکەدا بژی، ئەوا هەمان مافە باسکراوەکانی نیکانۆری دەبێت).

**تێبینیی پێنجەم:**

مرۆڤ سەرسام دەبێت کاتێك دەبینێ مامۆستای یەکەم بەو رادەیە ملکەچی دابونەریتە یۆنانییەکانە، تەنیا جارێك ئاماژە بە ئارەزووی کچەکە یان پرسیار لێکردنی نادات، یان هیچ نەبێت بڵێت (پاش رەزامەندیی کچەکە). هیچ پرس و راوێژێکی لە ژیان و داهاتووی خۆیدا بۆ نییە، بە مەش دڵنیا دەبین لەوەی ئەرەستۆ لە تیۆرەکەیدا لە سەر ژن ملکەچی نەریتە یۆنانییەکان بووە و بە هەمان هێز و حەماسەتی بەرگریکردنی لە مەسەلەی (کۆیلایەتیی) بەرگری لێکردووە و باسی چاکە و سوودەکانی دەکات بۆ هەردوولا: ئاغا و کۆیلەش. تاکە ژنێك ئەرەستۆ لە دەرەوەی پەیوەندی هەردوو ژنەکەیدا ناسیبێتی، ئۆلیمپیاسی دایکی ئەسکەندەرە، هەرچەندە پەیوەندییەکەیان شەخسی نەبووە، کەسایەتییەکی زۆر جیاوازی لە ژنەکانی تری

هەبووە (مەبەست لە ژنەکانی تری جگە لە هاوسەرەکانی، هـاوڕێ و ناسیاوەکانیشـی دەگرێتەوە. واتە بە گشتی ئەو ژنانەی کە لە ژیانیدا هەبوون و ڕۆڵیـان هەبووە).

ساڵی ٣٤٣ پ.ز ئەرەستۆ بانگهێشتکرا بۆ (پیللا) پایتەختی مەکدۆنیا تا ببێتە مامۆستای شازادە گەنجەکەیان (ئەسکەندەری مەکدۆنی). هەشت ساڵ لەوێ مایـەوە، ساڵی ٣٣٥ گەڕایەوە ئەسینا و قوتابخانە فەلسەفییە بە ناوبانگەکەی بە ناوی لۆکیـۆم دامەزراند.

لەو وڵاتەدا ئەرەستۆ ئەو ژنە بە هێزەی ناسی، کە دایکی ئەسکەندەر و هاوسەری شا فیلیپ بوو. پێش شووکردنی بەو شازادە و کاهینی ئەبیرۆس (ئەلبانیا) بوو، بۆیـە دەیویست نەفسێکی زاڵ لە ئەسکەندەردا بخولقێنێ، وەك خۆی دەسەڵاتدار بێت[٢٢].

مێژوونووسی ئینگلیـزی ن. تـارن وەهـا وەسـفی دەکـات: (ژنێـك بـوو مانـای میانڕەویی نەدەزانی، خۆپەرست بوو، شـێتانە هەڵدەچـوو و تـوڕە دەبـوو، لایـەنێکی سۆزداری وای هەبوو وایلێکـرد بـە حەماسـەتەوە پەرستشـە نهێنییـەکان لـە ترقیـا جێبەجێبکات و...هتد)[٢٣].

ئەم ژنە لە پشت کوڕەکەیەوە دەوەستا و ڕۆحی گـەورەیی و هێـز و سـەرکەوتنی تێدا دەخولقاند، هەر کاتێك لاوازیی یان دودڵییەکی تێدا بەدیبکردایـە سەرزەنشـتی دەکرد و هانیدەدا. لەو کاتەشی باوکی لەبەر مەی و ژن نەیدەپەرژایە سەری، ئەم لـە ئامێزی دەگرت. بۆیە ئەسکەندەر هەسـتیکرد خـۆی و دایکـی تـەنیان و بـاوکی بـە چەندین بڕوبیانوی جیاواز لێیان دووربوو، حەقی خۆیـانیی نـەدەدانێ...)[٢٤]. زۆرجـار باوکی بە نەرمی و لاوازی تۆمەتباری دەکرد، ژورەکەی نزیك بـوو لـە حەرەمسـەرای هۆڵی ژنانەوە[٢٥]: (پرچێکی ئـاڵتونی و دوو چـاوی ژنانـەت هەیە...چـۆن ڕووبـەڕووی مەترسییەکان دەبیتەوە...ها...)[٢٦].

ئەم ژنە پۆڵایینە توانی ماوەیەکی زۆر پێشبینی ئەرەستۆ خۆی قەڵابەند بکـات، پێش ئەوەی پڕکێشی ئەوە بکات سەردانی قوتابخانە تازەکەی ئەرەستۆ لە میزا بکات، کە بۆ فێرکردنی ئەسکەندەر و هاوەڵانی دایمەزراندبوو، نەهامەتییـەکانی یوریبیدسـی

به وردیی خوێندبووەوە، بە تایبەتی شـانۆگەرییەکەی لـە سـەر (میـدیا)ی شـازادەی کۆلخیس. پێیوابوو میدیاش وەك خۆی تەنیا بووە، هیچ نـەبووە لـە بەرامبـەر هێـزی پیاوانـدا یارمـەتی بـدات، جادوگـەریی نـەبێت. وەك خواوەنـدێکی زینـدووی نێـو پەرستگای حۆرییەکان وابـوو، کـە لـە عـەرەبانـە شاهەنشـاییەکەی دابـەزیبوو، دوو کەنیزەکی جوانیشی لەگەڵ بوون. جەستە نەرمەکەشی بە ئاوریشم داپۆشیبوو، کە بـا دەیلکاند بە جەستەیەوە. ژنانێکی کەمیش دەیانتوانی بـوێریی ئـەوەیان هـەبێت بـە میکیاژ و جەستەی رووتەوە(مەبەست پۆشینی بەرگێکە کە جەستە لە ژێرییەوە دیـار بێت) لە ماڵ بێنە دەرەوە، وەك ئـەوەی ئۆلمپیـاس دەیکـرد: (ئـەو خانمـە جوانـە لـە عـەرەبانەکەی دابەزی، فەیلەسوفەکەشمان بە لەز بەرەو رووی رۆیشت تا بەخێر هـاتنی بکات، پێکەوە پیاسەیەکیشیان کرد. لـە دوای خـۆی لـە میـزا کاریگەرییـەکی وای جێهێشتبوو، کردبوویە خاوەنی جوانییەکی ئەفسوناوی. سەبارەت بە داهاتووی کـوڕە تاقانەکەشی لە سەر دەستی ئەرەسـتۆ رەزامەنـدیی نیشـاندابوو، هـەر چـەندە پـاش گەڕانەوەی بە یەکێك لە فالّچییان (ئەرستاندەر)ی وتبوو: (فەیلەسوفە تازەکەمان کـە ناوی ئەرەستۆیە، فسەزمانە)[٢٧] و هیچ بیرێکی داهێنەرانەی نییـە، رەنگـە ناوبـانگی لەوەوە هاتبێت، کە یەکێك بووە لە باشترین قوتابییەکانی ئەفلاتون[٢٨].

# تەوەری یەکەم

## بوونـیـادی تیـۆرەیی

(( هەرکات پێویستیکرد، دەبـێ بفەلسـەفێنین. ئەگـەر پێویستی بە فەلسەفاندنیش نەکرد، هەر دەبێ بفەلسەفێنین، تا بیسەلمێنین، کە پێویستمان بە فەلسەفاندن نییە)).

ئەرەستۆ: پرۆتریپتیکۆس **Protrepticus**
((کۆکراوەی بەرهەمەکانی، بەرگی دووەم ل ٢٤١٦))

# بەشی یەکەم
# سەرەتایەك لە ئەپستمۆلۆژیا

((دەستپێك، ئەو بنەمایانەیە کە ئەقڵ دیارییان دەکات، ئەوە بنەڕەتی یەکەمی زانستە...ئەم بنەمایانە دەمانگەیەنن بە هۆکارەکان، کە دەبنە پێشەکییەکان، ئەو فاکتانەشی تێبینییان دەکەین دەبن بە ئەنجامەکان، کەوابێ بنەماکانی ئەپستمۆلۆژیا بە گوێرەی سیستەمی ئەقڵیی جیهان دیاریدەکرێن...)).

- لیندا لانچ: ژن گیانلەبەرێکی ئاقل نییە ل٧.
- هێرمان راندالْ: ئەرەستۆ ل٤٦.

## یەکەم
## ئارەزووی زانین

ئەرەستۆ کتێبی (میتافیزیك) بەم شێوەیە دەستپێدەکات و دەڵێ: (خەڵکی هەموویان بە سروشتی خۆیان حەزیان لە زانینە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو چێژەیە کە لە بەکارهێنانی هەستەکانیانەوە وەریدەگرن. ئێمە کاری هەستەکانمان خۆشدەوێت (بەدەر لە سوودەکانیان) بە تایبەتی هەستی بینین، بینینمان زیاتر لە هەر شتێکی تر خۆشتردەوێت، نەك تەنیا ساتی کردنی کارێك، بەڵکو ئەو کاتەشی کە کارێك ناکەین. هۆکاری ئەمەش ئەوەیە هەستەکان زانینمان پێدەبەخشن و تیشك دەخەنە سەر زۆرێك لەو جیاوازییانەی لە نێوان شتەکاندا هەن)[29].

جا چۆن ئەرەستۆ بەم حەزەی ئێمەی زانیوە؟! وەڵامەکەش لەوەدایە، کە دەربارەی چێژی هەستەکانمان دەیڵێت. ئەگەر ئەو زانینەی بە دوایدا وێڵین وەسیلەیەك بووایە بۆ ئامانجێکی گەورەتر، وەك زاڵبوون بە سەر ئەوانی تردا بۆ نموونە، ئەو کات ئارەزووی زگماکیی ئێمە لە حاڵەتێکی وادا ئارەزوو نابێت بۆ زانین، بەڵکو ویستی هێزە یان پاڵنەرێکە بۆ داگیرکردن. پاشان هەستکردنمان بە چێژ لە بەکارهێنانی هەستەکانماندا بۆ خۆی بەڵگەیە لە سەر حەزکردنمان لە زانین، چونکە سەرەڕای بەکارهێنانی هەستەکان لە رێکخستنی خۆماندا لەم جیهانەدا و بەدەستهێنانی چەند ئامانجێکی کردەیی، ئێمە لە پشتەوەی ئەم کارانەمانەوە هەوڵی خودی زانینەکەش دەدەین[30].

هەستکردن، هەرچەندە دەشێ ببێتە بنچینە بۆ زانینی هەندەکی، بەڵام زانینێکی راستەقینەمان پێنابەخشێت (چونکە زانین وەك ئەرەستۆ دەڵێت، زانینی هەمەکییە). ئەوەی هەستەکان پێماندەبەخشن لە شارەزایی (الخبرة)، ناگاتە ئاستی زانینێکی زانستی یان فەلسەفی، چونکە هەستەکان شارەزاییمان لا کەڵەکە دەکەن و هەندەکیمان پێدەناسێنن، لەگەڵ دیاردە جیاوازەکان، وەك ئەوەی بزانین ئاگر گەرمە،

یاخود فلان دەرمان سوکراتی لە فلان نەخۆشی رزگارکرد. ئەمانەش هەموویان زانینی گرنگن لە ژیانی کردەییدا، بەلام ئەگەر بمانەوێ هەڵکشێین بەرەو زانینی فەلسەفی نابێت بەوەندەوە راوەستین، بەڵکو دەبێت هەوڵی زانینی ئەو هۆکارە بدەین کە دیاردە بینراوەکانی نێو زانینی هەستەکیی پێکەوە گرێ دەدات. دەمانەوێ بە دوای ئەو هۆکارەدا بگەڕێین بە مەبەستی گەیشتن بە زەرورەت: بۆچی ئاگر هەمیشە گەرمە؟ بۆچی ئەم دەرمانە چارەسەری فلانە نەخۆشی دەکات؟ لایەنگرانی شارەزایی رەنگە بزانن شتێك هەیە، بەلام هۆکاری بوونی نازانن. کەچی زانینی ناسراو بە حیکمەت یان فەلسەفە، ئەمیان دەتوانێ هۆکاری یەکەمی بوون بزانێت، واتە ئەو زانینەیە، کە دەگاتە ئاستی دەرککردنی هەمەکییەکان، کە ئەمانیش تەفسیری هەندەکییەکان دەکەن[31].

ئەمەش واتە شارەزایی بەرهەمی کۆبوونەوەی دەرککردنە هەستییەکانە، کە تەنیا دەتوانن هەندەکییەکان دەرکبکەن (ئاگر سوتێنەرە و ئەم دەرمانە چارەسەری سەرئێشەیە و...هتد). ئەمانەش بە سوودن بۆ ژیانی کردەیی، بەلام ناگەنە ئاستی زانینی فەلسەفی.

زانینی راستەقینەش، زانینی فەلسەفییە، هەوڵی ئەوە دەدات ئەو هۆکارە بزانێت، کە تەفسیری ئەم دیاردانە دەکات: بۆچی ئاگر سوتێنەرە و بۆچی هەمیشە گەرمە؟ یان بۆچی فلانە دەرمان چارەسەری سەر ئێشەیە؟ ئێمە بنەڕەتی شاراوەی پشتەوەی دیاردەکانمان دەوێت. فەلسەفەش ئەو زانستەیە کە دەگاتە زانینی هەمەکیی، کە تەفسیری هەندەکییەکان دەکات.

## دووەم
## زانینی فەلسەفی

کەواتە ئەرکی فەلسەفە، لای ئەرەستۆ، ئەوەیە لەو جیهانەی تیایدا دەژین تێبگەین، بە جۆرێکی وا بگەینە هۆکارە یەکەمینەکان و ئەو بنەما بنەڕەتییانەی لە سەریان بەندە. مەبەست لە جیهانیش لێرەدا: جیهانی سروشتییە بە هەردوو بەشەکەیەوە: ئەندامی و نائەندامی لە لایەکەوە، لەگەڵ ئەو جیهانەشی خۆمان دروستمانکردووە، واتە جیهانی کۆمەڵایەتی و سیاسەت و ئەخلاقی و...هتد لە لایەکی ترەوە. زانینی شتێکیش، وەك باسکرا، واتە زانینی ئەو هۆکارەی دەستی لە خولْقاندنیدا هەبووە: چۆن دروستبووە؟ بۆچی دروستبووە؟ بە چ شێوازێك دروستبووە و...هتد.

ئیلیاییەکان، پێیانوایە حەقیقەت گۆڕانی بە سەردا نایەت، بوون (هەبوو)ە و ناشێ (نەبوو) بێت، ئەوەشی دەگۆڕێت تەنیا رووکەشە و ناگاتە پلەی حەقیقەت. ئەفلاتونیش جەخت لەو بیرۆکەیە دەکاتەوە، کە لەوانەوە وەریگرتووە و گەیشتە ئەوەی، مادام جیهانی هەستەکان دەگۆڕێت کەواتە حەقیقی نییە، چونکە حەقیقەت لە جیهانی نموونەیی (ئیدیاڵ)دایە، کە ئەزەلییە و هیچ گۆڕانێکی بە سەردا نایەت. زانینی راستەقینەش، زانینە دەربارەی ئەم جیهانە، چونکە یەکسانە بە زانینی ئەزەلی و زەرووری و هەمیشەیی، کە بەردەوام وەك خۆی دەمێنێتەوە.

دواتر ئەرەستۆ هات و پشتگیری لە هەمان بیرۆکە کرد. لە کتێبی (ئەخلاقی نیکۆماخی) دا پرسی: زانین چییە؟ دواتر لە وەڵامدا دەڵێت: مەرجی بنەڕەتی زانین بە مانا وردەکەی ئەوەیە: (( ئەوەی دەیزانین، نابێ غەیری خۆی بێت. هەروەها بابەتی زانینەکانمان سیفەتی زەروورەتیان هەیە، بۆیە ئەزەلی و ئەبەدین، چونکە هەرشتێك

سیفەتی زەرورەتی هەبێت بە جۆرێك ئەزەلییە، ئەوەشی ئەزەلی بێت ناشێ گۆڕانی بە سەردا بێت)[٣٢].

زانینی راستەقینە ئەوەیە، بەڵگەی بوونی شتەکان بە دەستەوە بدەین، لەگەڵ بوونی جیهان وەك گشتێك و ئەو بەشانەشی پێکیدەهێنن، بەمەش بە دوای ئەو هۆکارەدا دەگەڕێین، کە بەم شێوەیە خوڵقاندویەتی نەك بە شێوەیەکی تر.

بەڵام ئەم دیدەی ئەرەستۆ تەنیا بە سەر زانینی جیهانی سروشتیدا کورت نابێتەوە، بەڵکو جیهانی مرۆییش دەگرێتەوە، بۆیە دەبینین بە قوڵایی کتێبە سیاسی و ئەخلاقییەکانیدا رۆچووە. وەك میتۆد جیاوازی نییە لە نێوان تێگەشتنمان لەم دوو جیهانە، ئەو بۆ نموونە لە کتێبی ئەخلاقی نیکۆماخیدا کاتێك باسی رۆڵی فەیلەسوفی ئەخلاقیمان بۆ دەکات، دەڵێت: (لێرەدا -وەك لە بابەتەکانی تریشدا- پێویستە بە فاکتەکان یان دیاردەکان وەك ئەوەی کە دەردەکەون دەست پێ بکەین، پاش ئەوەی کە کێشە یان ئاڵۆزییەکان گفتوگۆ دەکەین، دێین راستی بۆچوونە باوەکان دەسەلمێنین. ئەمە ئەگەر بتوانین ئەم کارە بکەین)[٣٣].

بەم مانایەش ئەرکی فەیلەسوفی ئەخلاقی لای ئەرەستۆ ئەوەیە: هەستێت بە رزگارکردنی هەر بۆچوون و پێوەرێکی باوی ئەخلاقی لە هەر خەوش و دژیەکییەك یان ناڕوونییەك کە تێکی بدات یان بیشێوێنێت، پێشیوایە کە راستی تیایدا لە پێشترە لە هەڵە. ئەمەش واتە ئەخلاقی ئەرەستۆیی بە رادەیەکی زۆر تەقلیدییانەیە، چونکە هەڵدەستێ بە روونکردنەوەی مانا باوەکان و هێنانەوەی پاساوی ئەقڵی بۆیان. ئەو پێی وا نییە کە پێویستە جیهان بە شێوەیەکی تر بێت، بەڵکو بڕوایەکی پتەوی بەوەیە، کە دۆخی باو-ئێستا، باشترین شێوەیە بۆ بوونی شتەکان. جا شتەکانی نێو جیهانی سروشتی بن یاخود جیهانی کۆمەڵایەتی[٣٤]. دواتر دێینە سەر باسی نموونە پراکتیکییەکانی لە بایۆلۆژیاشدا.

ئەوەندە هەیە ئەرەستۆ بە شێوەیەکی دۆگماتیکییانە بەم دیدە موحافیزکارییەی وەرنەگرتووە، بەڵکو پاساوی خۆی هەبووە. ئەویش ئەو وەزیفەیەیە کە شتێك ئەنجامی

دەدات (ئەمەش بیرۆکەیەکە لە ئەفلاتونی مامۆستای وەرگرتووە)[٣٥]. ئەرەستۆ پێیوایە بوونی هەرشتێك بەو شێوەیەی کە هەیە لەبەر بوونی وەزیفەیەکی دیاریکراوی ئەو شتەیە، ئەگەر وەزیفەکەی لە دەست بدات، پاساوی بوونیشی نامێنێت. هەموو شتێك وەزیفەی خۆی هەیە، مانەوەشی بەڵگەیە لە سەر هەستانی بەو وەزیفەیە بە باشترین شێوە. لە سەرەتای کتێبی (سیاسەت) دا دەڵێت: (پێناسەی هەر شتێك بە وەزیفەکەی و توانای راپەڕاندنی ئەو وەزیفەیە دەبێت، ئەگەر شتێك نەتوانێت وەزیفەی خۆی جێبەجێبکات، نابێ بڵێین کە هەمان شتە، با هەمان ناویشی هەبێت)[٣٦].

ئاواش بیرۆکەی وەزیفە رۆڵی گرنگی لە فەلسەفەی ئەرەستۆدا هەیە، لە تێگەشتنمان لە هەردوو جیهانی سروشتی و کۆمەڵایەتی. پاش کەمێك ئەم خاڵە زیاتر روون دەکەینەوە.

دەبێت بزانین چەند داخوازییەکی پێویست و پێشینەیی هەن، تا بتوانین دەرکی هەبووەکان بە پێی وەزیفەیان بکەین. ناتوانین بڵێین شتێك پەیوەندی بە شتێکی ترەوە هەیە، تەنیا بە وەزیفەکەیدا نەبێت. ئەمەشە هۆکاری ئەوەی، کە بەشەکانی جەستە باشترین نموونەی ئەو شتانەن کە لەڕووی وەزیفەوە بیریان لێدەکەینەوە. ئەگەر گریمان وەزیفەی هەبووە زیندووەکان (بە جۆرێك) هاوتا بێت لەگەڵ وەزیفەی شتە نازیندووەکان (دەستکردەکان)، پێویستە لە ئاستی پەیوەندییان بە یەکەوە و بە جیهانیشەوە وەك گشتێك تەماشای بکەین. ئەرەستۆش ئەم جۆرە دیدگایەمان بۆ جیهان پێدەبەخشێت.

هەر چەندە ئەرەستۆ ددان بەوەدا دەنێت، کە دیمۆکریتۆسی فەیلەسوفی سروشت دەیزانی دیاردە سروشتییەکان زەروورن، لەگەڵ ئەوەشدا رەخنەی لێدەگرێت، چونکە چەمکی مەبەست یان ئامانجی پشتگوێ خستووە. دەڵێت: (ڕاستە دیمۆکریتۆس هۆی ئامانجەکیی-العلة الغائیة-ی پشتگوێ خستووە، چونکە هەموو پرۆسە سروشتییەکانی داوەتە پاڵ زەروورەت. راستە کە زەروورین، بەڵام هۆکاری بەم شێوەیە بوونیان لەبەر مەبەستێکی دیاریکراو یان هۆیەکی ئامانجەکییە، یاخود بۆ ئەنجامدانی

باشترین کاره لە هەر حاڵەتێکدا، هیچ شتێك نابێتە ڕێگر لەبەردەم شتەکاندا تا بەو شێوەیەی خۆیان بن)[٣٧].

دەربڕینی کۆتایی سەرنجمان بۆ شتێکی گرنگ لە ڕێبازی ئەرەستۆدا رادەکێشێت، ئەویش تێڕوانینی هیرارکییانەیە بۆ گەردوون. گەردوون لای ئەرەستۆ ریزبەند کراوە، لە بێ گیانەوە بۆ رووەك، پاشان بۆ ئاژەڵ و ئینجا بۆ مرۆڤ. دوای مرۆڤیش لە تەنە ئاسمانییەکانەوە بۆ خواوەند. بە شێوەیەکی سەربەرەو ژوورانە (تصاعدی)ی ورد داڕێژراوە. بۆیە توانیویەتی بڵێت لە هەردوو جیهانی سروشتی و هونەریدا[٣٨]، هەمیشە دەبینین ئەوەی خوارەوە لە بەرژەوەندی ئەوەی سەرەوەی خۆیدایە. تەنانەت نەفسیش بەشی نزم و باڵای هەیە، بەشی باڵای لەبەر ئەقڵانی بوونیەتی کە باڵایە. خودی ئەم بنەمایەش دەشێ دابەش ببێتە سەر دوو بەش: لایەنی تیۆریی و لایەنی کردەیی. ئەگەر بەشەکانی نەفس هەمان ریزبەندییان تێدا بێت، ئەو کات پێویستە ئەو چالاکییانەشی ئەنجامی دەدەن ئەو ریزبەندیەیان تێدا بێت[٣٩]. ئەمەش ڕێگە خۆشکەر بوو بۆی تا بگاتە ڕێسا بە ناوبانگەکەی: (سروشت هیچ کارێکی بێهودە ناکات).

لێرەوە، لە تیۆری زانینی ئەرەستۆیی چەند تێبینییەکی گرنگ هەڵدەهێنجین:

١- زانین بە هەست دەست پێ دەکات، بەڵام ئەوە بە زانست ناژمێردرێت، چونکە بە هەندەکیمان دەگەیەنێت، لە کاتێکدا زانینی راستەقینە زانینی هەمەکییە.

٢- زانینی راستەقینە زانینی فەلسەفییە، بەوە لە شارەزایی جیا دەبێتەوە، کە بە چەند زانیارییەکی خێرا لە سەر چەند دیاردەیەك رازی نابێت، بەڵکو دەپرسێت: بۆچی شتەکە بەم شێوەیە بوو، بە شێوەیەکی تر نەبوو؟!

٣- ئەمەش واتە زانینی فەلسەفیی بە دوای هۆکاردا دەگەڕێت، تا زەرووری بوونی شتەکە بسەلمێنێت. ئەم هۆکارە بنەمای ئەقڵیی شاراوەیە لە پشتەوەی شتەکە. بەم شێوەیەش زانینی راستەقینە، زانینی ئەو زەرورەتەیە کە جێگیرە و ناگۆڕێت.

٤- ئـەم دیـدە بـۆ زانـین بـە سـەر جیهـانی سروشـتیدا دەسـەلمێت و هـەبووە سروشتییەکان لێك دەکاتەوە، هەر وەك بـە سـەر جیهـانی مرۆییشـدا دەچەسـپێت و دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیش لێك دەداتەوە.

٥- بۆ ئەوەی بتوانین بەم زانینە بگەین، دەبێـت چـەند بیرۆکەیـەکی بنـەڕەتیمان هەبێت و لێیان تێبگەین، کە وەك کلیل وان بۆ ئەم ڕێبازە. ئەوانیش:

أ- هیرارکییەتی گەردوون.

ب- بیرۆکەی وەزیفە.

ج- هەیولا و فۆرم (وێنە).

ئەمانەش بە وردیی لە بەشی داهاتوودا باس دەکەین، تا بزانین چـۆن ئـەم کلیـل یان بیرۆکانەی بە سەر جیهانی ژندا پراکتیك کردووە. ئەو هەر لە سەرەتاوە دەیـەوێت زانینێکی فەلسەفیی لە سەر ژن هەبێت، واتـە بزانێـت بۆچـی زەرووریـی بـۆ دۆخـی کۆمەڵایەتیی ژن ئاوا بێت؟ ئەو پاساوە ئەقڵییـە کامەیـە کـە پێویسـتی دەکـات ژن پاشکۆی پیاو بێت؟ هەروەها بۆ ئەوەی پراکتیك کردنی بیرۆکەی هیرارکییەت بە سـەر خێزانیشدا ببینین، پیاوی بە باڵا دادەنا و ژنیش بە نزم (ئەوەشی نزمـە لـە خزمـەتی ئەوەی سەرەوەی خۆیدایە). پاشان چۆن پیاو بوو بە هەیولا و ژنیش بە فۆرم، ژن مادە و پیاویش بنەمای ئەقڵیی.

بەم شێوەیە وەزیفـەی ژن دیـار دەبێـت. بـە کـورتی بـا ببیـنین چـۆن ئەرەسـتۆ میتافیزیکەکەی هێناوە و بە سەر جیهانی ژندا پراکتیکی کردووە، ئەمـەش هـەمان تێبینەکەی فرانسیس بیکۆنە (لە سەر پەیوەندی لۆژیك و فەلسەفەی سروشت) کاتێك ئەرەستۆ فەلسەفەی سروشتی کردووە بە شوێنکەوتە و خزمەتکاری لۆژیـك، بەمـەش کردیە توێژینەوەیەکی جێگەی مشتومڕی زۆر، کە سودێکی ئەوتۆی لێ نەمایەوە)[٤٠].

# بەشی دووەم

# پایە میتافیزیکییەکان

* بیرۆکـە میتافیزیکییـەکانی ئەرەسـتۆ، پایـەی هـەرە سەرەکیی بوون لە هەموو نووسینەکانیدا..
* ئەرەستۆ بیرۆکەکانی دەربارەی لۆژیك و میتافیزیکا هێنا و بە سەر سروشتدا پراکتیکی کرد...

فرانسیس بیکۆن: نیو ئۆرگانۆن

## یەکەم
## هیرارکییەتی گەردوون

وەك ئاماژەمان پێدا بە رای ئەرەستۆ: (سروشت هیچ کارێکی بێهـودە ناکـات). گەردوون زۆر بە وردیی رێکخراوە- پلەبەندیی کراوە، هـەبووەکانی ناویشـی ب ەپێـی ریزبەندییەکی سەر بەرەو ژوورانە، بەبیٚ هیچ هەڵـە و کەموکورتییـەك رێکخسـتووە: (لەبەر ئەمەش دەتوانین بڵێین ئێمە هەمیشە خۆمان لە هەردوو جیهانەکەدا: جیهـانی سروشتی و جیهانی هونەری لەبەردەم ریزبەندییەکدا دەبینینـەوە، کـە تیایـدا ئـەوەی نزمە لە بەرژەوەندی ئەوەی لە خۆی بالاٌترە هەیە، ئەوەشی بالاٌیە لەبـەر ئـەو بنـەما ئەقلّییەیە، کە تێیدایە...)[41]. ئەگەر لە نێو هەبووەکاندا لـە نزمـەوە بـەرەو بـەرزتر تەماشا بکەین، دەتوانین ئەم بنەمایـە ببیـنین. بـیٚ گیانـەکان (کـە نـزمترین پلـەی هەبووەکانن) لە خزمەتی رووەکـدان، واتـە (ڕووەك) لـە سـەر ئـەوان دەژی و گەشـە دەکات و هەناسە دەدات. تا پلەیـەکیش بچـینە سـەرەوە، هـەمان بنـەما دەبیـنین. ئەرەستۆ دەڵێت: (دەتوانین بڵێین رووەك لە پێناوی گیانلەبەراندا هەیە، گیانلەبەرانیش بۆ خزمەتی مرۆڤ هەن: ئاژەڵی ماڵی بۆ دابینکردنـی خـۆراك و ئـاژەڵی کێـویش بـۆ پۆشاك، یان دەتوانێت بۆ مەبەستی جیاواز بەکاریان بهـێنیٚ. ئەگـەر سروشـت هـیچ کاری بێهودە نەکات و بیٚ کەموکورتی بێت، دەتوانین لەمـەوە بگەینـە ئـەوەی، کـە هەموو شتێکی بۆ خزمەتی مـرۆڤ خولّقانـدووە)[42]. کەواتـە هـەموو هـەبووەکان لـە خزمــەتی مرۆڤـدان، چـونکە لــە سـەرووی هەموویانەوەیـە (لـە لوتکـەی هـەرەمی هەبووەکاندایە) یـاخود بـالاٌترین هـەبووە لـە ناوچـەی ژێـر هەسـارەی مانگـدا، لـە هیرارکییەتی گەردووندا.

بەلاٌم ئەگەر هیرارکییەتێك لـە گەردوونـدا هـەبێت و ئـەوەی بـە سـەر هـەبووە مادییەکاندا دەچەسپێت، بە سـەر مرۆڤەکانیشـدا بچەسـپێت، ئـەو کـات پێویسـتە

هیرارکییەتێکی کۆمەڵایەتیش هەبێت، واتە لە نێو خودی جیهانی مرۆڤەکاندا، واتە لێرەشدا مرۆڤەکان پلە و نمرەیان هەبێت، هەندێکیان لە هەندێکی تریان بالاتر بن، ڕێك بەو شێوەیەی لە گەردووندا هەیە. هیرارکییەتێك لە نێوان گەلاندا هەیە، چونکە ویستی سروشت وایە، کە جۆرە جیاوازییەکی لەو شێوەیە هەبێت، بەوەی هەندێکیان زیرەکییەکی کەم و جەستەیەکی بە هێزیان هەبێت، هەندێکی تریشیان شیاوی ژیانی سیاسەت بن. ئەگەر واش بێت، خەڵکانێك هەن بە سروشت ئازادن و هەندێکیش بە سروشت کۆیلەن. (گەلانی بەستەڵەکی باکور و ئەوروپا ئازان[٤٣] بۆیە کەس ناتوانێت ئازادییان لێ زەوت بکات، بەڵام زیرەکیی و کارامەیی و سیستەمی سیاسەت باشیان نییە، بۆیە ناتوانن بە سەر دراوسێکانیاندا زاڵبن. ڕۆژهەڵاتییەکان زیرەك و کارامەن، بەڵام ئازا نین، بۆیە هەمیشە دۆڕاو و بە کۆیلەکراون. بەڵام گەلی یۆنانی هەردوو سیفەتی ئازایەتی و زیرەکییان تیایە، پێگەی وڵاتەکەشیان کەوتووەتە نێوانی ئەو دوو لایەنەوە، بۆیە ئازادی خۆی دەپارێزێت، ئەگەر یەکگرتوش بێت دەتوانێت بە سەر هەمولایەکدا زاڵ بێت)[٤٤]. کەوابێ تاکی یۆنانی ئاغا و ئازادە و بیانی (بەربەری)ش کۆیلەی ئەوە، چونکە تاکی یۆنانی برای یۆنانی خۆی بە کۆیلە ناگرێت. ئەمەش هەمان بیرۆکەی گەلی هەڵبژێردراوە (الشعب المختار) کە ئەرەستۆ وەك سەرەتایەکی هەمەکی زەروریی سەیری دەکات و نەیتوانیوە نەریتی سەردەمەکەی خۆی تێپەڕێنێت[٤٥].

کەواتە هیرارکییەتێك لە نێوان گەلاندا، واتە لە نێوان خودی ڕەگەزی مرۆییدا هەیە. هەیانە (وەك یۆنانییەکان) بەرز و بالایە و هەشیانە (وەك بەربەرییەکان) واتە غەیرە یۆنانییەکان بە گشتی، نزم و سوکن. بۆیە لە کاتی هێرشەکەی ئەسکەندەر بۆ سەر ڕۆژهەڵات[٤٦]، نامەیەکی بۆ نووسیوە و تیایدا ئامۆژگاری دەکات، کە جیاوازی بکات لە مامەڵەکردندا لە نێوان یۆنانی و بەربەرییەکاندا: (وەك سەرکردەیەك مامەڵەی یۆنانییەکان بکە. بەڵام وەك ئاغا-خاوەن کۆیلە- مامەڵەی ڕۆژهەڵاتییەکان بکە، چونکە بەربەرییەکان بە سروشتی خۆیان ملکەچی یۆنانییەکانن)[٤٧].

چونکە یۆنانییەکان ئەو گەلەن کە هەردوو سیفەتە چاکەکەیان تێدایە: زیرەکی و ئازایەتی، یاخود کارامەیی و رۆحێکی بەرز، ئەم سیفەتانەش وایانکردووە هەمیشە ئازاد بێت، بتوانێت سیستەمێکی سیاسی نایاب دابنێت ، ئەگەر یەکگرتویی سیاسەت هەبووایە دەیتوانی حوکمی گەلانی تریش بکات. بەڵام هەمان ئەم جیاوازییانەی نێوان یۆنانییەکان و گەلانی تر، لە نێوان خودی یۆنانییەکانیشدا هەن[٤٨]. ئەگەر کەسانێك پێیانوایە خەڵکی یەکسانن[٤٩]: پادشا و پیاوێکی ئاسایی، ئاغا و کۆیلە، ژن و پیاو یەکسانن، ئەوانە لە وەهمدا دەژین، چونکە لای ئەوان ئەمانە نەك لە جۆر (نوع) دا، بەڵکو لە ژمارەی ئەو کەسانەدا جیاوازن، کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن. ئەگەر مامەڵە لەگەڵ یەك کەس یان ژمارەیەکی کەمی خەڵکیدا بکات، ئەوا ئاغا یان خاوەن کۆیلەیە. ئەگەر ژمارەیەك لەوە زیاتر بن، ئەوا سەرۆك خێزانە. بەڵام ئەو کەسەی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر و بەرچاوی خەڵکیدا مامەڵە دەکات، ئەوا سیاسی یان پیاوی دەوڵەت یاخود پادشایە. ئەمەش تیۆرەیەکە ناشێت راست بێت، چونکە لە نێوان ئەم خەڵکانەدا چەند جیاوازییەکی جەوهەریی هەیە[٥٠].

بەم شێوەیە و هەر لە سەرەتاوە، زۆر راشکاوانە و بە ئاشکرا، ئەرەستۆ رایدەگەیەنێت کە هیرارکییەتێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە نێوان خودی کۆمەڵگای یۆنانیشدا هەیە. سروشت لە هەموو جێگەیەکدا جیاوازی خستووەتە نێوان باڵا و نزم، نەفس و جەستە، ئەقڵ و شەهوەت، مرۆڤ و گیانلەبەران و نێر و مێ وە. لە هەر جێگەیەکیشدا ئەم جیاوازییانە لە نێوان دوو هەبوودا هەبن، لە بەرژەوەندی خۆیان دەبێت، کە یەکێکیان حوکم بکات و ئەویتریان ملکەچ بێت. سروشت ویستی لە خولقاندنی ئەم جیاوازییانەیە لە نێوان مرۆڤەکاندا، یەکێکیان بە هێز دەکات و توانای کارکردنی پێدەبەخشێت، ئەویتریان زیاتر بۆ کاری سیاسی شیاو دەکات، لێرەوە هەندێك بە سروشتی خۆیان ئازادن و هەندێکیشیان بە سروشت کۆیلەن[٥١].

گرنگە هەمیشە ئەوەمان لە یاد بێت، کە ئەم (بنەمای نایەکسانی) یە یان بنەمای باڵا و نزم و حاکم و مەحکومییە، دەستکردی مرۆڤ نییە، بەڵکو بنەمایەکی

سروشتییه، بۆیه له نێوان هەموو هەبووەکاندا هەیە. هەبووە بێ گیانەکان نزمترین پلەن، بۆیه دەبینین له لایەن بوونەوەرە زیندووەکانەوە حوکم دەکرێن. ئەمانەش دەبنە یەکەم ئەڵقە لە پلەبەندیی سروشتیدا، چونکە لە دوو رەگەز (عنصر) پێکدێن (نەفس و جەستە) یەکەمیان بە سروشتی خۆی حاکمە و دووەمیشیان مەحکوم[٥٢]. تەنانەت لە نێوان ئەم هەبووە سروشتییانەشدا هەیانە زیندووە و هەیانە بێ گیانە، ئەندامی و نائەندامییان تیادایە. تیایاندا (بە جۆرێك لە یەقینەوە) دوو جۆر دەسەڵات دەبینین، یەکەمیان لە دەسەڵاتی ئاغا بە سەر کۆیلەکانییەوە دەچێت، دووەمیشیان لە دەسەڵاتی سەرۆك بە سەر هاوڵاتییاندا دەچێت: نەفس بەو دەسەڵاتەی ئاغا حوکمی جەستە دەکات، ئەقڵیش بەو دەسەڵاتەی سەرۆك حوکمی شەهوەت دەکات[٥٣]. لەم میانەیەدا ئەرەستۆ وەك بنەمایەکی سوود بەخش باسی بنەمای نایەکسانی دەکات: (بۆ جەستە خۆی باشترە کە نەفس حوکمی بکات، هەروەها سروشتی و بە سوودیشە کە لایەنی هەڵچوون لە دەرووندا ئەقڵ کۆنترۆڵی بکات. لە کاتێکدا بنەمای یەکسانی یان پەیوەندییەکی پێچەوانە (واتە کۆیلەکان حوکم بکەن) بە بەردەوامیی زیان بە هەردوولا دەگەیەنێت.

بە هەمان شێوەی پەیوەندی نێوان نەفس و جەستە، ئەم هاوکێشەیە بە سەر پەیوەندی نێوان مرۆڤ و گیانلەبەرانیشدا دەچەسپێت، گیانلەبەری ماڵی بە سروشتی خۆی لە گیانلەبەری کێوی باشترە. بۆ هەمووشیان پێکەوە واباشترە کە مرۆڤ حوکمیان بکات، چونکە لەم حاڵەتەدا سوودی مانەوەیان دەست دەکەوێت. لە لایەکی ترەوە پەیوەندی نێوان نێرینە و مێینە، بە سروشتی خۆی، پەیوەندییە لە نێوان لایەنی باڵا و سەرکەوتوو بە لایەنی نزم و ملکەچەوە، زاڵبوونێکی تەواوە بە سەر لایەنی مەحکومدا، ئەم بنەما گشتییەش بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەموو هەبووەکان دەشێت[٥٤].

ئەگەر بیرۆکەی هیرارکییەت یارمەتیدەر بێت بۆ تیشك خستنە سەر دۆخی ژن، ئەو کات دەتوانین بڵێین: هەموو بیرۆکەکانی تری نێو میتافیزیکای ئەرەستۆ هەمان

کار دەکەن: (لە راستیدا چەمکە فەلسەفییەکانی ئەرەستۆ دەربارەی بزوتن و بزوێنەر، بوونی هێزەکی و بوونی کردارەکی، هەر وەك بیرۆکەکانی هەیولا و فۆرم و بیرۆکەی وەزیفە، ئەرەستۆ هەموویانی بەکارهێناوە بۆ جیاوازیکردن لە نێوان نێرینە و مێینەدا. تیۆرەکەشی لەم بارەیەوە بە جۆرێك رێساوە تا لەگەڵ فەلسەفەکەیدا بگونجێت، بۆیە جیاکردنەوەی لە پاشماوەی تری رێبازەکەی کارێکی ئاسان نابێت)[٥٥].

بەڵام ئێمە تەنیا دوو بیرۆکەی بنەڕەتی دەخەینەڕوو، کە لە کارەکەی ئێمەدا یارمەتی باشمان دەدەن ئەوانیش: بیرۆکەی وەزیفە و بیرۆکەی هەیولا و فۆرمن...

## دووەم
## بیرۆکەی وەزیفە

ئەرەستۆ لە سەرەتای کتێبی (سیاسەت)دا و لە کاتی پێناسەکردنی شتەکاندا دەڵێت: (هەموو شتێك شوناسی خۆی لە جۆری وەزیفە و توانای لە بەجێ گەیاندنی وەزیفەکەیەوە وەردەگرێت. لێرەوە دەگەینە ئەوەی ئەو شتەی نەتوانێت وەزیفەی خۆی بەجێ بگەیەنێت، ناتوانین بڵێین هەمان شتی پێشووە، هەتا ئەگەر هێشتا هەمان ناویشی هەبێت)[٥٦]. هەموو شتێکی ئەم جیهانە وەزیفەیەکی هەیە و خەسڵەتی جەوهەریی خۆی لە بەجێ گەیاندنی ئەو وەزیفەیەوە وەردەگرێت: تەور بۆ بڕینە، چاو بۆ بینینە، دەست بۆ وەرگرتن و پێدانە، پینەچی پێڵاو پینەدەکات و پزیشك چارەسەری نەخۆش دەکات و...هتد. هەموو شتێك وەزیفەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە. ئێمەش دەڵێین فلان دکتۆرێکی باشە، یان فلانە تەور تیژ و باشە، ئەمە ئەگەر وەزیفەی خۆیان بە باشی جێبەجێکرد. ژەنیاری شارەزا ئەوەیە کە وەستایانە ئامێرەکەی دەژەنێت. پەیکەرتاشی باش پەیکەری جوان دروست دەکات. چاو بێ عەیبە ئەگەر بە باشی ببینێت، تەور بێ عەیبە ئەگەر بە باشی ببڕێت. هەروەها بۆ هەموو شتەکانی تریش، هەریەکە و وەزیفەی خۆی هەیە، کە رەنگە بە باشی یان بە خراپی پێی هەستێت، بەڵام لە حاڵەتێکی وادا ئایا مرۆڤ وەزیفەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە (وەك ئەوەی مرۆڤە، نەك وەك ئەوەی کە پزیشکە یان دارتاشە یان فیتەرە، واتە وەك مرۆڤ)..؟ ئایا وەزیفەیەکی لەو شێوەیەی هەیە؟ تا ئەگەر پێی هەستا بوترێت بە کارێکی تایبەت بە مرۆڤ هەستاوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، پێویستە لایەنە جیاوازەکانی مرۆڤ شیتەڵ بکەین، تا بزانین کامیان زاڵن و سیفەتی جیاکەرەوەی مرۆڤن لە بوونەوەرەکانی تر؟

لایەنێك هەیە دەشێت پێی بڵێین چالاکی سەربەستانە، کە ژیان(تەنیا ژیان)ی تێدا دەردەکەوێت، وەك هەناسەدان و خواردن و هەرسکردن و...هتد. بەڵام ئەم ژیانە تایبەت نییە بە مرۆڤ، بەڵکو رووەك و گیانلەبەرانیش لەگەڵی هاوبەشن تیایدا. ئەگەر مرۆڤ بەم کارانە هەستا ناتوانین بڵێین بە کارێکی تایبەت بە خۆی هەستاوە[٥٧].

لایەنێکی تر هەستە جیاوازەکانە، وەك بینین و بیستن و چەشتن و بۆنکردن و...هتد. ئەمانە راستە لە رووەکدا نین، بەڵام هێشتا تایبەت نین بە مرۆڤەوە، چونکە گیانلەبەریش ئەم هەستانەی هەیە. بۆیە هەستانی بەم وەزیفەیە مانای تایبەت بوونی ئەم وەزیفەیە نییە بە خۆیەوە.

لایەنی سێیەم و کۆتایی، چالاکی ئەقڵی یان ژیانی ئەقڵییە بە شێوەیەکی گشتی. ئەمەش تایبەتە بە مرۆڤ، رووەك و گیانلەبەر هاوبەشی نین تیایدا. بە جۆرێك دەتوانین بڵێین: هەر کەسێك بە باشترین شێوە بەم چالاکییە هەستێت، مانای وایە بە باشترین شێوە بەم وەزیفەیە هەستاوە و دەبێتە مرۆڤێکی باڵا، چونکە ئاقل بوونی مرۆڤ تەنیا بە بیرکردنەوە نابێت، بەڵکو پێویستە ئەقڵی کۆنترۆڵی ئارەزوو و رەفتارەکانیشی بکات. بەمەش بێت فەزیلەتەکانی مرۆڤ تەنیا ئەقڵی نابن، بەڵکو ئەخلاقیش دەبن.

لە سەرەتای (ئەخلاقی نیکۆماخی) دا ئەرەستۆ پێی وایە، بەختەوەریی ئامانجی کۆتایی هەموو چالاکییەکی مرۆڤە، دواتر باسی چییەتی ئەم بەختەوەرییەمان بۆ دەکات: (ڕەنگە بتوانین پێناسەی بکەین، ئەگەر لە سەرەتادا وەزیفەی مرۆڤ بزانین و دیاریی بکەین). (ئەخلاق ١٠٩٧ب، ب٢ ل١٧٣٥).

بە پێچەوانەی هەبووە نزمەکانەوە، وەزیفەی مرۆڤ بۆ بە جێگەیاندنی ئامانجێك نییە تا خزمەتی یەکێك لە خۆی بەرزتری پێبکات. هەر چەندە مرۆڤ هەندێك خەسڵەتی هاوبەشی لەگەڵ هەبووە نزمەکاندا هەیە، وەك خواردن و گەشەکردن و هەرسکردن، بەڵام بە ئەقڵ لەوان جیایە و باڵاترە. تا ئەمەش خەسڵەتی سەرەکیی مرۆڤ بێت، چاکە بۆ مرۆڤ بریتییە لە ژیانێکی چالاکانەی بنەمای ئەقڵی. (ئەخلاق أ، ب٢ ل١٧٣٥). پەیوەندی مرۆڤ بەم بوونەوەرانەوە بۆ بەدەستهێنانی مەبەستێکی

دیاریکراوە. هەر چەندە توانای ئەقڵیی وای لێ دەکات لە خواوەند بچێت، کە هەموو ژیانی لە تێڕامانی ئەقڵییدا بە سەر دەبات، بەڵام بۆ بەدیهێنانی مەبەستی خۆی کـار دەکات نەك هــی خواوەنـد. ئامــانجی ئــەو بەختــەوەری خۆیــەتی نــەك پڕکردنــەوەی پێویستییەکانی ئەوانی تر[٥٨].

ئەو وشەیەی ئەرەستۆ بۆ مرۆڤ لە رووی سروشت و وەزیفەوە بـە درێـژایی ژیـانی بەکاریدەهێنێت، وشەی (Anthropos)ە. ئەمەش وشەیەکی یۆنانییە مانای بـوونی مرۆیی دەدات. بەڵام هەر زوو لەوە تێدەگەین، کـە کەمینەیـەکی کـەم لـە رەگـەزی مرۆیی، بە رای ئەرەستۆ، مانای ئەم وشەیە دەیانگرێتەوە، ئەوانیش (پیاوانی یۆنانیی ئازاد)ن. بۆیە گروپێکی کەم بەشدارن لەوەی پێی دەڵێت فەزیلەتە مرۆییەکان. چونکە فەزیلەتــەکان یــەکێك نــین، مرۆڤــەکانیش یــەکێك نــین، بــەڵکو فەزیلەتــەکان هیرارکییەتێکیان هەیە بە هەمان ئەو شێوەیەی هیرارکییەتی مرۆڤەکان، کە ئەرەستۆ لە ژێر کاریگەری نەریتی ئەو سەردەمەی کۆمەڵگای یۆنانیدا ریزبەندی کردوون[٥٩].

ئەم کەمینەیــە (دەســتەبژێری مرۆیــی)ن، لوتکــەی مــرۆڤن، وەزیفــەیان تــەنیا تێڕامانی ئەقڵیی پەتی یان خۆچـواندنە بــە خواوەنـدەکان، پێویسـتیان بــە سـامان و هاوڕێ و کاتی بەتاڵ هەیە. ئاشکرایە هەندێك کاروبار پێویستی بە خزمــەتی ئــەوانی تر هەیە. لێرەوە ئەرەستۆ - بە پێی بنەمای مەبەسـتگەرایی (الغائیـة)- پێـی وایــە زۆرینەی مرۆڤەکان، نەك تەنیا گیانلەبەران، بە سروشـتی خۆیـان بــەرەو ئــەوە دەڕۆن ببنە ئامرازێك بۆ دابینکردنی پێویستی و ئاسودەیی بۆ کەمینەکە، تـا بتوانێـت بــە خۆشحاڵییەوە بە وەزیفەی خۆی هەستێت و لە تێڕامانی خۆی بەردەوام بێـت. لێــرەوە دەبینین هەرچی ژن و کۆیلە و پیشەگەر و دارتــاش و کەسـانی تـری وێنــەی ئــەمیان هەیە، هیچ نین جگە لە چەند ئامرازێکی یاریدەدەر کە یارمەتی مــرۆڤ دەدەن (مــرۆڤ بە مانا زۆر بەرتەسکەکەی) تا بە باشترین شێوە بــە وەزیفــەی خــۆی هەسـتێت، تــا ئەوپەڕی بەختەوەریی خۆی دەستەبەر بکات.

ئاوەهاش وردە وردە بیرۆکەی (وەزیفە)ی ئەرەستۆ روون دەبێتەوە. هەروەها بە روونی لە پەیوەندی نێوان ئەو کەسانەشدا دەردەکەوێت کە پێی وایە بە سروشتی خۆیان حاکم و مەحکومن: وەك ژن و مێرد، ئاغا و کۆیلە و...هتد و وەزیفەی هەریەکەیان دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەو رۆڵەی بۆ هەر تاکێك و ئەو توانا و ئیمکانیاتەی هەیەتی، کە زۆر جیاوازە لەگەڵ کەسانی تردا: (ئەم بەشەی بەڵگەهێنانەوەکەی لایەنێکی جەوهەرییە لە بەڵگەهێنانەوەی دەربارەی کۆیلە). سەرەڕای ئەوەی کۆیلە بە ئامێرێك یان ئامرازێکی زیندوو دادەنرێت، ئەرەستۆ پێی وایە کۆیلایەتی بۆ ئاغا و بۆ کۆیلەش بەسوود و دادپەروەرانەیە، پەیوەندییەکەیان لە بنەڕەتەوە بۆ پاراستنی خۆیانە، ئەمەش چونکە سوودیان یەکە و بەرژەوەندیشیان هاوبەشە. (سیاسەت ١٢٥٥- أ،ب)[٦٠].

لە راستیدا ئەگەر لەگەڵ ئەرەستۆ بەردەوام بین، دەبینین سوودی هاوکێشەکە بە پلەی یەکەم بۆ بوونەوەرە بەرزەکەیە. بۆیە دەڵێت: پەیوەندی نێوان ئاغا و کۆیلە لە جەوهەردا بۆ سوودی ئاغایە و وەك رووکەشیش بۆ کۆیلەیە، ئەگەر بمانەوێت دەسەڵاتی ئاغا بەردەوام بێت، پێویستە کۆیلە بهێڵینەوە. (سیاسەت ١٢٧٨-ب). بەم شێوەیەش ئەرەستۆ بەردەوام دەبێت لە قسەکردن لە سەر هەر جووتێکی (نێو ئەو پەیوەندییەی پێیوایە نابێت سوودەکەی دابەشبکرێت بە سەر لایەنەکاندا، چونکە سوود بۆ لایەنە بالاکەیە. لە قسەیەکی روون و راشکاودا دەربارەی ژن و دەسەڵاتی پیاو بە سەر ژناندا دەڵێت: دەشێت مەحکوم بچوێنین بە دروستکەری نەی و حاکمیش بەو ژەنیارەی کە -نەی-ەکە دەژەنێت.)(سیاسەت- ١٢٧٧-ب).

ئەوەی مەترسیدارە، ئەرەستۆ ئەمە بە شتێکی سروشتی دادەنێت. سروشتێك کە هیچ کارێکی بێهودە ناکات، ئەو هەبووەکانی بەو شێوەیە ریزکردووە، بۆ هەریەکێکیشیان وەزیفەیەکی داناوە تا لە خزمەتی ئەوەی سەرەوەی خۆیدا بێت. ئاوەهاش (بە حوکمی سروشت) ژنان لە پیاوان نزمترن و وەزیفەیان خزمەتکردنی پیاوانە. بۆیە سروشتییە ئەگەر پیاوان حوکمیان بکەن. هەموو ئەم وەزیفە و پلە و

دۆخانەش بە حوکمی سروشتن، نەك نەریت یاخود لاساییکردنەوە. لێرەوە دژایەتییەکی سەرسەختانەی سۆفیستاییەکان دەکات، چونکە ئەوان پێیان وابووە هەموو ئەم دۆخە کۆمەڵایەتییانە، بە بەها ئەخلاقییەکانیشەوە، زادەی خوو و نەریتن. ئەم دۆخانە لای ئەرەستۆ، تەنانەت ئەگەر بەرهەمی نەریتیش بن، کەچی لەگەڵ دووبارەبوونەوەیاندا دەبنە سروشت[٦١]. ئەگەر ناچاربین نەریتە سروشتییەکان وەرگرین، بە رای ئەرەستۆ رۆژێك دێت، تیایدا ئەنجامدانی کاری باشەمان دەبێتە سەرچاوەی چێژ وەرگرتنمان. ئەمەش ئەو وتەیەی هاملێتمان بیر دێنێتەوە کاتێك بە دایکی دەڵێت: (بانگەشەی فەزیلەت بکە ئەگەر نەشتوانی ئەنجامی بدەیت، چونکە نەریت ستەمکارێکی دڵڕەق و کاریگەرە، بە جارێك ئەقڵ هەڵدەلوشێت).

بە هەمان شێوە ئەرەستۆش دەڵێت: (بۆ نەریتیش هەر وایە، چونکە ئەوەی دەبێتە نەریت، بە جۆرێك دەبێتە سروشت. لە راستیدا نەریت و سروشت هاو شێوەن، چونکە دووری نێوانیان (زۆرجار، هەمیشە) زۆر نییە. سروشت لەگەڵ بیرۆکەی هەمیشەدایە و نەریتیش لەگەڵ بیرۆکەی زۆرجاردایە)...(١٣٧٠ - ٣)[٦٢].

ئاوەهاش ئەرەستۆ بە ئازادییەکی تەواوەوە، لە خوو و نەریتی ئەو کاتەی کۆمەڵگاکەیەوە دەگوازێتەوە سەر ئەوەی زگماکی و سروشتییە و دژی خەسڵەتە بە دەستهاتووەکانە.(بەراوردی ئەخلاق ١١٠٣-أ بکە).

## سێیەم
## هەیولا و فۆرم

لای ئەرەستۆ هەموو شتێکی ئەم دونیایە لە مادە و فۆرم پێکهاتووە، مەبەستمان لە مادەش ئەوە نییە، کە بیری لێدەکەینەوە، تەختە یان مس یان بەرد و...هتد. بەڵکو ئەمانەش بۆ خۆیان لە مادە و فۆرم پێکهاتوون. مەبەست لە مادە ئەو (هەیولا) یان (هەویر) یان کەرەستە خاوەیە کە دەشێت لە قالبێکدا پێکبێت، ئەمەشیان دەبێتە فۆرم. ئەم هەویرەیە ئەرەستۆ ناوی دەنێت هەیولا (Hyle). ئەوەی پێی دەڵێین تەختە رەنگە بۆردێك، مێزێك یاخود رەفەیەکی کتێب بێت و...هتد. ئەمانەش فۆرمن (Form)(Eidos)[٦٣].

ئاشکرایە لێرەدا فۆرم گرنگترە، چونکە ئەو رەگەزی جەوهەرییە، ماهییەتی شتەکە دیاریی دەکات و لە شتەکانی تری جیادەکاتەوە. هەر ئەویش (جەوهەر)ی هەبووەکە دیاریی دەکات. لە نموونەکانی پێشوودا تەختەکە نەگۆڕابوو، هەر خۆی بوو، بەڵام ئەوەی هەبووەکان لە یەك جیادەکاتەوە و هەمەڕەنگییان پێدەبەخشێت، فۆرمە، ئەگەر ئەم بگۆڕێت، هەبووەکەش دەگۆڕێن. بەڵام مادە یان هەیولا لە بەرامبەر فۆرمدا هیچ بەهایەکی نییە. بۆ نموونە مێز، دەتوانیت بە ئارەزووی خۆت مادەکەی بگۆڕیت و بیکەیتە مس، تەختە، شوشە یان مەڕمەڕ و...هتد. لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە (مێز)ی دەمێنێتەوە، چونکە لە هەموو حاڵەتەکاندا فۆرمەکە نەگۆڕاوە. کەچی ئەگەر فۆرمەکە بگۆڕیت و مادەکە بهێڵیتەوە، دەبینی لەبەردەم دوو شتی جیاواز دایت، با مادەکەشیان یەکێك بێت (تەختە بۆ نموونە)، کەچی یەکێکیان دەبێتە مێز و ئەویتریان دەرگا یان پەنجەرە یان کورسی. هەمووشیان لە یەك مادەن (کە تەختەیە) بەڵام شتی جیاوازن، چونکە فۆرمیان جیاوازە.

فۆرم گرنگترە و جەوهەری بنەڕەتی و ماهیەتە، رەگەزی ئەقڵییە لە بەرامبەر رەگەزی مادیدا کە هەیولایە. ئەگەر دووبارە گوێ لەو قسەیەی ئەرەستۆ بگرین، کە

دەڵێت: (ئەوەی لە پلەبەندیی هەبووەکاندا لە سەرەوەیە، لەبەر ئەو بنەمایەی تیایدایە لە سەرەوەیە). ئێستا دەتوانین بڵێین: بە پێی رادەی زاڵبوونی فۆرم بەسەر هەیولادا، هەبووەکان لە پلەبەندییەکەدا سەردەکەون. بەڵام ئەگەر پێچەوانەی ئەمە روویدا و مادە بە سەر فۆرمدا زاڵبوو، ئەو کاتە هەبووەکە دێتە خوارەوەی پلەبەندییەکە. ئەم پارچە بەردە بە ئاشکرا مادەی تیا زاڵە، فۆرم تیایدا شاراوەیە و نییە. یان دەتوانین بڵێین: ئامادەیە لە هەر فۆرمێکدا یا لە چەند فۆرمێکی هەمەڕەنگدا پێك بێت. دەشێت پەیکەرێك بێت بە دەست پەیکەرتاشەوە، یان ورد بکرێت و بکرێتە بەشێك لە دیوار یان پرد یاخود لایەکی شۆستەیەکدا و...هتد. لەبەر ئەم هۆیەش لە خوارەوەی پلەبەندییەکەدا دادەنرێت. ئەمەش حاڵی هەموو شتێکی بێ گیانی ترە، کە فۆرم تیایدا شاراوەیە و بنەمای ئەقڵیی تیایدا ونە.

ئەگەر پلەیەك بەرز بینەوە، لە مەملەکەتی رووەکدا، بە روونییەکی زیاترەوە فۆرم دەبینین. لێرەدا دەگەینە بوونەوەرە زیندووەکان. راستە ئەمانیش هەبووی سروشتین، بەڵام ژیانیان هەیە: (مەبەست لە ژیانیش واتە بخوات و گەشە بکات و خۆی بەیر بکاتەوە...)[٦٤]. نەفس بەم کارە جیاوازانە هەڵدەستێت، نەفسیش جەوهەرە، واتە فۆرمی جەستەی سروشتییە. لەم حاڵەتەدا ئەرەستۆ ناوی دەنێت نەفسی هەناسەدەر (الغازية)، دەڵێت: (یەکەم و فراوانترین هێزەکانی نێو نەفسە، هەموو بوونەوەران بەمە دەژین و دوو وەزیفەی هەیە: وەچەخستنەوە و خواردن). ئاوەهاش رووەك پلەیەك لە هەبووە بێ گیانەکان (نازیندووەکان) بەرزترن.

ئەگەر جارێکی تر بەرز بینەوە، دەگەینە مەملەکەتی گیانلەبەران، کە لەوێدا نەفسی بخۆر هەیە، کە مایەی ژیانە بۆ بوونەوەرە زیندووەکان. هەروەها نەفسی هەستکەر (الحاسة)یش هەیە، چونکە گیانلەبەر بە تەنیا ناخوات و بزێت، بەڵکو دەبینێت و بۆن دەکات و تام دەکات و...هتد. واتە هەستەکانی بەکاردێنێت، ئەمە جگە لەوەی دەجوڵێت. ئەمانەش چەند خەسڵەتێکن دەیخەنە سەرووی رووەکەوە، چونکە نەفسی هەستکەری هەیە.

له لوتکەی هەرەمی سروشت یان جیهانی ژێر هەسارەی مانگدا مرۆڤ هەیە، کە فۆرم زۆر بە روونی دەردەکەوێت، چونکە ئەقڵ یان نەفسی ئاقڵی هەیە. مرۆڤ تاکە بوونەوەرە، کە ئاقل بێت، چونکە بنەمای ئەقڵیی لە هەبووەکانی تری جیادەکاتەوە. هەرچەندە نەفسی هەناسەدەری هەیە و بەمەش هاوبەشە لەگەڵ رووەك و لە نەفسی هەستکەریشدا هاوبەشە لەگەڵ گیانلەبەراندا، بەڵام نەفسی ئاقڵی هەیە، کە تایبەتە بە خۆی و لەوانی تری جیادەکاتەوە[٦٥].

لێرەوە دەتوانین بڵێین: باڵاترین هەبووی نێو سروشتە، چونکە باڵاترین فۆرمی هەیە، هەموو هەبووەکانی تریش بۆ خزمەتی ئەم هەن: (سروشت هەموو شتێکی لە بەرژەوەندی مرۆڤ خوڵقاندووە) وەك پێشتر باسمانکرد. بەم شێوەیە دەبینین، کە چەند بە روونیی هیرارکییەت بە نێو میتافیزیکای ئەرەستۆدا رۆچووە و چ پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە بیرۆکەی هەیولا و فۆرمەوە هەیە[٦٦].

# تەوەری دووەم

# نموونە پراکتیکییەکان

## بەشی یەکەم

## مێینە و بایۆلۆژیا

((ئەگەر ئەبۆکراتس تاڕادەیەك شایەنی ئەوە بێت پێی بڵێین باوکی پزیشکی، ئەو کات ئەرەستۆ شایەنی ئەوەیە پێی بوترێت باوکی بایۆلۆژیا)).

جۆرج سارتۆن (مێژووی زانست) ب٣ ل ٢٧٧

((بیر و راکانی ئەرەستۆ لە بایۆلۆژیادا کاریگەرییەکی گەورەی لە سەر سەدەکانی دوای خۆی هەبوو، زیاترێك لە سەر بیرکردنەوەی تیۆریی بنیاتیی نابوو، وەك لەوەی لە سەر ئەزموون)).

سیمۆن دی بۆڤوار (پیری) ل ٢١-٢٢

## یەکەم
## بایەخدانی ئەرەستۆ بە بایۆلۆژیا

ئاساییە ئەگەر ئەرەستۆ گرنگی بە بایۆلۆژیا بدات، تیایدا بە دوای نموونەی پراکتیکیدا بگەڕێت بۆ تیۆرەکانی دەربارەی وەزیفە و هیرارکییەت و فۆرم و هەیولا و...هتد، بە جۆرێك کە تیۆرەکەی دەربارەی ژن پشت ڕاست بکەنەوە. باوکی ئەرەستۆ (نیکۆماخۆس) لە خێزانێك بووە، چەندین نەوە بە پزیشکییەوە سەرقاڵ بوون، بۆ خۆشی پزیشکی تایبەتی پادشا ئەمینتاسی دووەم، باپیری ئەسکەندەر بوو[٦٧]. چاوخشاندنێکی خێرا بە نووسینەکانی مامۆستای یەکەمدا، بۆمان دەردەخات چەندە گرنگی بە بایۆلۆژیا داوە، بە ڕادەیەك بووە بە گرنگترین بواری توێژینەوەکانی. ڕاستە ئەو مەوسوعەیەکی گەورەی هەموو زانستەکان بوو لەو سەردەمەدا، لە زانست و فەلەکناسی و بیرکاری و سروشت، بێگومان جگە لە زانستە فەلسەفییەکان (کە ئەمەشە هۆکاری ناونانی بە مامۆستای یەکەم) بەڵام لە بایۆلۆژیادا پێشەنگ بووە[٦٨].

جا لەبەر بە هێزیی تێبینییەکانی، یان ئەو بەڵگانەی لە تێبینیی کەسانی ترەوە کۆیکردبوونەوە، یاخود لەبەر گفتوگۆ تیۆرییەکانی بێت، وەك ئەوەی دەیڤد ڕۆس دەڵێت: (بە ڕاستی ئەرەستۆ بەبێ ڕکابەر لە کۆندا، گەورەترین زانای بایۆلۆژیا بووە)[٦٩]. تەنانەت زانایەکی گەورەی بایۆلۆژیای مۆدێرنی وەك (چارلز داروین) دەربارەی دەڵێت: (من لینایۆس و کوڤییەم دەپەرست، بە شێوەی پەرستنی جیاواز. بەڵام ئێستا- بە بەراورد بە ئەرەستۆی پیر- لە دوو قوتابی زیاتر نین)[٧٠].

لێرەوە مەترسی بۆچوونە بایۆلۆژییەکانی ئەرەستۆ دەردەکەوێت، کە ماوەیەکی زۆر بە سەر بیری مرۆییدا زاڵ بوون، ڕەنگە درێژتر بێت لەو ماوەیەی لۆژیکە فۆرمییەکەی باوبوو. تا سەدەی پێشوو هەر زاڵ و کاریگەر بوو، سەرەڕای ئەو هەڵانەی لەو بۆچوونانەیدا هەن: (کتێبی مێژووی گیانلەبەران باشترین نووسینی

ئەرەستۆیە و گەورەترین بەرهەمی زانستی وڵاتی یۆنانە لە سەدەی چوارەمی پ.ز دا. بایۆلۆژیا بیست سەدە چاوەڕێ مایەوە، تا کتێبێك بنووسرێت شان لە شانی بدات)[٧١]. ئەرەستۆ لەم کتێبەدا زیاتر لە پێنج سەد جۆر گیانلەبەری باسکردووە. ڕەنگە بۆ ئێستا ئەم ژمارەیە زۆر نەبێت، بەڵام بۆ ئەوکات زۆر بووە. لە باوکییەوە توێکاری فێربووبوو، بۆ خۆی زیاتر لە پەنجا گیانلەبەری توێ توێ کردووە، بەڵام تەنانەت یەك لاشەی مرۆڤیشی توێ توێ نەکردووە. (ڕەنگە کۆرپەلەیەکی توێ توێ کردبێت)، بەڵام زانیاری راستەوخۆی لێ وەرنەگرتووە[٧٢]. ئەو زانیارییەکانی لە چەند سەرچاوەیەکی جۆراوجۆرەوە وەردەگرت: لەوانەش تێبینی کەسانی تر و شوان و راوچییانی (گیانلەبەر و باڵندە و ماسی) لە دەریای ئیجە. بۆیە ئەو سێ کتێبە بایۆلۆژییەی کە باسی (مێژووی گیانلەبەر) دەکەن ئەوانیش- (بەشەکانی گیانلەبەر) و (سروشتی گیانلەبەر) و (زاوزێی گیانلەبەر)[٧٣] هەمان بەهایان نییە، هەندێکیان چەند ئاماژەیەکی گشتین بەبێ وردەکاریی و روونکردنەوە، هەندێکیشیان گێڕانەوەی چەند چیرۆکێکن کە گەڕیدەکان گێڕاویانەتەوە[٧٤]. دەگێڕنەوە ئەسکەندەری مەزن، فەرمانی بە راوچییانی خۆی و پاسەوانی راوەکانی و راوچییانی تر و غەیری ئەمانیش داوە، کە هەرجۆرە گیانلەبەرێکی ویست، بیدەنێ و هەر زانیارییەکیشی ویست پێی ببەخشن[٧٥]. لێرەدا گرنگە ئاماژە بە دوو خاڵ بدەین:

یەکەم: وەك وتمان دەستپێك (سەرەتا) ئەو بنەمایانەیە، کە ئەقڵ دیارییان دەکات، ئەوەتا لێرەدا ئەرەستۆ بە دوای فۆرم و مادەدا دەگەڕێت و ئەو هیرارکییەتەی باسمانکرد بە روونیی دیارە. بە جیاوازیکردن لە نێوان هەبووە زیندووەکان و بێ گیانەکان دەست پێدەکات. باسمانکرد کە دووەمیان لە خزمەتی یەکەمیاندایە، واتا بێ گیانەکان لە خزمەتی ژیاندان بە شێوەیەکی گشتی. بەڵام لێرەشدا لە مەملەکەتی ژیاندا و لە نێوان خودی بوونەوەرە زیندووەکانیشدا، جیاوازی دەکات. هەر لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی سەر بەرەو ژوور ریزکراون: سەرەتا رووەك، لە سەرووی ئەوانەوە گیانلەبەران، لە سەرووی ئەمانیشەوە مرۆڤ. پێوەریش بۆ سەرکەوتن و

ژێرکەوتن لەم پلەبەندییەی گیانلەبەراندا، بریتییە لە بڕی گەرمی لەو بوونەوەرە زیندووەدا. ئەوەی لە خوارەوەی ریزبەندییەکەدایە، کەمترین گەرمیی تێدایە. دەڵێت: (لە پلەبەندیی زیندەوەراندا بە گشتی، جیاوازی و پلەبەندیی لە پلەی گەرمیدا بە روونی دەبینین) (٥٨٨- ١ ب)[٧٦]. سروشتیش هەنگاو بە هەنگاو لە بێ گیانەکانەوە بەرەو زیندەوەران دەچێت[٧٧].

دووەم: ئەو دیدگایەی ئەرەستۆ بۆ بایۆلۆژیا هەیەتی، هەمان دیدە فەلسەفییەکەیەتی لە تێگەشتنی جیهاندا. بایۆلۆژیا یان هەر زانستێکی تر، تەنیا کۆمەڵێك فاکت نییە، کە توێژەر لە رێگەی بینین یان تێبینی کردنەوە کۆی بکاتەوە و پاشان هەستێ بە لێکدانەوەی و...هتد، بەڵکو زانینی راستەقینە (کە دواجار زانینی فەلسەفییە) ئەوەیە هەستین بە دانی پاساوی ئەقڵیی بۆ لێکدانەوەی ئەوەی بۆچی ئەو فاکتانە بەم شێوەیە بوون و بە شێوەیەکی تر نەبوون. لە هەر کایەیەکی تری زانیندا بێت، هەوڵی زانینی فەلسەفی دەدەین، زانینی فەلسەفیش بریتییە لە کەشفکردنی زەرورەتی ئەقڵیی، کە لەناو فاکتەکاندا شاراوەیە[٧٨]. ئەمەش واتە: (لێکدانەوەی فاکتەکان پشت بە کۆمەڵێك بنەما دەبەستێت، کە زۆرجار بنەماگەلێکی میتافیزیکین. خاڵی دەستپێك لە هەر بابەتێکدا ئەم بنەمایانەی تێدایە، کە لە رێگەی ئەقڵ یان ناوسەوە Nous پێیدەگەین، تا بگەینە ئەوەی کە ئەمە تاکە رێگەی فەلسەفییە بتوانین لە رێگەیەوە لە واقیع تێبگەین. ئەقڵ وەك ئەرەستۆ دەڵێت یەکەم بنەڕەتی زانستە)[٧٩]. ئەم بنەما میتافیزیکییانە، بە رای ئەرەستۆ، دەمانگەیەننە دۆزینەوەی ئەو هۆکارانەی، کە دەشێت پێشەکییەکان بن، لە کاتێکدا ئەو فاکتانەی تێبینییان دەکەین ئەنجامەکان بن. ئەمەش چونکە بنەماکانی زانست، لای ئەرەستۆ، بە پێی سیستەمی ئەقڵیی جیهان دیاریی دەکرێن[٨٠].

بەم شێوەیە دەبینین بایۆلۆژیا، تەنیا چەند فاکتێك نییە تا پشتگیری تیۆرەکەی لە سەر ژن پێبکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە، پراکتیککردنێکی نموونەییە بۆ بیرۆکە میتافیزیکییەکانی، بیرۆکەی وەزیفە و هیرارکییەت و مادە و فۆرم و...هتد، وەك

پاش کەمێکی تر روونی دەکەینەوە. لێرەدا دەردەکەوێت نزم بوونی ژن لەبەر ئەوەیە تەنیا (هەیولا)یە، لە کاتی منداڵبووندا تەنیا کەرەستەی خاومان دەداتێ. کەچی پیاو بالاترە، چونکە ئەو (فۆرم) یان (ئەقڵ) یان (ڕۆح)ەیە، کە ژیان بەو کەرەستە خاوە دەبەخشێت[81].

ژن گەرمیی لە پیاو کەمترە، بۆیە لەویش نزمتر دەبێت. ژن لاوازتریشە، چونکە مادە پاسیڤە و فۆرم ئەکتیڤە[82]. ئەمانە و زۆر بیرۆکەی تریش، کە لایەنگیری لە تیۆرەکەی ئەرەستۆ لە سەر ژن دەکەن، دایدەبەزێننە پلەیەکی ناوەندیی لە نێوان کۆیلە و پیاوی ئازاددا.

## دووەم

# بایۆلۆژیا و سروشتی ژن

ئەو بیرۆکەیــەی فەیلەســوفی فەڕەنســی گاســتۆن باشــلار (١٨٨٤-١٩٦٢) کــە دەڵێت: هیچ زانایەك بە زیهنێکی خاڵی لە بیر و بۆچوونەوە لە بابــەتێك ناکۆڵێتــەوە، واتە (بە بوونیاتێکی ئەقڵیی بەتاڵــەوە)، بــەڵکو لــە کاتێکــدا لــە بابەتــە زانســتییە جیاوازەکان دەکۆڵێتەوە، چەندین بیرۆکە (و بۆچوونی) پێشینە ئامادەکراوی هەیە. ئەو بیرۆکەیەی باشلار بە سەر هیچ زانایەکدا بە هێندەی ئەرەستۆ، کە زانای بایۆلۆژیا بوو ناچەسپێت! بەڵام باشلار، کە پێیوایە کاتێك رۆح خــۆی بــۆ رۆشــنبیرییەکی زانســتی ئامادە دەکات، گەنج نییە، بەڵکو پیرە و تەمەنێکی زۆری بڕیوە، تەمــەنی بــە قــەد تەمەنی ئەو حوکم و بۆچوونە پێشینانەیە کە هەیەتی[٨٣]. واتــە ئــەم رۆحــە هــەڵگری چەند بۆچوونێکی پێشینەیە. ئەگەر باشلار وا دەڵێت، مەبەستی ئەوەیە زانا پێویستە سەرەتا بە پرۆسەی پاککردنەوەی ئەقڵیی (التطهیر العقلي) هەستێت، بۆ ئەو بیرۆکــە زاڵانەی کە بە زیهنییەوە نوساون[٨٤].

ئەمەش فرانسیس بیکۆن باسیکردووە، کاتێك دەڵێت ئەرەستۆ، بــیرە لــۆژیکی و میتافیزیکییــەکانی دەگوازێتــەوە ســەر سروشــت[٨٥]. رەنگــە باشــترین بوارێــك ئــەم بیرۆکەیەی ئەرەستۆی دەربارەی ژن تێدا دەربکەوێت، بواری بایۆلۆژیــا بێــت. کاتێــك دێتە مەیدانەوە، خۆی بە پاشخانێکی میتافیزیکی پڕ چــەك کــردووە، کــە رێنمــایی دەکات و بیرکردنەوەی ئاراستە دەکات: تیایدا بە دوای مادە و فۆرمدا وێڵە، وەك لــە بەشی پێشوودا باسمانکرد، مادام فۆرم باڵاترە، کەواتە دەبێت پیاو فۆرم بێت. ئەمەش چەند ئەنجامێك بە دوای خۆیدا دەهێنێت، کە لە بەشــی دواتــردا (بەشــی سیاســەت)

باسی دەكەین، بەوەی لەبەر ئەوەی پیاو ئەقڵی زیاترە، بۆیە دەبێت ئەو حوكم بكـات. ژنیش ئەقڵی نوقسانە، بۆیە دەبێت تەنیا گوێ بگرێـت و فـەرمان جێبـەجێ بكـات. هەروەها لـە بایۆلۆژیـادا بـە دوای هیرارکییەتـدا دەگـەڕێت، پلەبەنـدیی بوونـەوەرە زیندووەكان، كاتێك ئەوەی نزمە بـۆ خزمـەتی بەرزەكـە هەیـە. هـەر وەك بـە دوای وەزیفەشدا دەگەڕێت، كە هەر ئەندامێك پێی هەڵدەستێ و چـوار هۆكارەكـە (العلـل الاربع) و...هتد. با لە سەرەتاوە دەست پێ بكەین.

بینیمان ئەرەستۆ چەندە بایۆلۆژیای بە بابەتێكی گرنگ زانیوە، بەڵام بە جۆرێـك سەیری كردووە، وەك ئەوەی تویێژینەوە لە سێ بابەتی سەرەكی بكات، ئەوانیش:

١) مەسەلەی وەچەخستنەوە Reproduction or Generation.

٢) مەسەلەی هەستكردن Sensation.

٣) مەسەلەی جووڵە Movement.

بابەتی یەكەم وەك بنەڕەتێك وایە بۆ دوو بابەتەكەی تر، چونكە بە خـودی خـۆی (لە خۆیەوە هەیە Per se) بەڵام دووانەكەی تر، دوای بوونی ئەم پەیدا دەبن. بۆیە بە شێوەیەكی سەرەكی گرنگی بەمەیان دەدەین. ئەرەستۆ چەندین دیمەن و تێبینیی بەهێز دەربارەی وەچەخستنەوە (مناڵبوون) دەهێنێتەوە و پێی وایە مناڵبوون بە سـێ رێگـە دەبێت:

أ) وەچەخستنەوەی خود بە خود Spontaneous Generation.

ب) وەچەخستنەوە لە رێگەی یەك باوانەوە Single paren[٨٦]

ت) وەچەخستنەوە لە رێگەی دایك و باوكێكەوە two parent.

مامۆستا یۆنانییەكەمان بڕوای بە لەدایكبوونی خود بە خـود هـەبوو، تەنانـەت ئەم تیۆرە بۆ چەندین سەدە ئەقڵی هەموو مرۆڤەكانی داگیركردبـوو، تـا لـە سـەدەی هەژدەدا و لە سەر دەسـتی زانـای فەڕنسـی لـویس پاسـتیۆر (١٨٢٢-١٨٩٥)، لـە ئەنجامی تاقیكردنەوەكانی لە سەر بەكتریا، توانرا هەڵبوەشێنرێتەوە[٨٧].

لە دایکبوون لە یەك باوانەوە، ئەرەستۆ لای وابوو لە جیهانی رووەکدا روودەدات، لەگەڵ هەندێك لەو گیانلەبەرانەی کە لە وەستاویی و نەجوڵاندا لە رووەك دەچـن. لـە راستیدا زیاتر گرنگی بە تیۆری سێیەم دەدات و لە ئێستاشـدا هـەمان تیـۆر بـە لای ئێمەوە گرنگـە، چـونکە چـەند بابـەتێکی گرنگـی باسـکردووە، کـە پەیوەندییـەکی راستەوخۆی بە تیۆرەکەیەوە دەربارەی ژن هەیە.

ئەرەستۆ زۆر گرنگی بە وەچە خستنەوە یان لە دایکبوون داوە و پێی وایە زیـاتر لە هەر کارێکی تر (سروشتی)یە، ئەمەش بۆ بوونەوەرە زیندووە پێگەیشتووەکان، یان ئەوانەی گەشەیان کامڵ بووە، وەزیفەیەکی سروشتییە بـۆ ئـەم بوونەوەرانـە، چـونکە تاکە رێگەیە بۆ گەیشتن بە نەمریی. دەڵێت: (سروشتیترین وەزیفەی هەر بوونەوەرێك، کە کامڵ بێت نەك نوقستان- واتە وەچەخستنەوە تیایدا خود بە خود نەبێت- ئەوەیە کە بوونەوەرێکی هاوشێوەی خۆی لە دوای خۆی جێبهێڵێت: گیانلەبەر گیانلەبـەرێکی تر، رووەك رووەکێکی تر، بە جۆرێك بە پێی وزەی خۆی بەشـدار بێـت لـە ئـەزەلی و ئیلاهیـــدا. ئەمـــەش کەڵکەڵـــەی هـــەموو بوونـــەوەران و ئامـــانجی چـــالاکییە سروشتییەکانیانە. بەڵام پاش کەمێکی تر بۆمان دەردەکـەوێت، کـە تـەنیا نێرینەیـە نەمریی دەست دەکەوێت، چونکە ئەو رۆح بە کۆرپەلە دەبەخشـێت. لێـرەدا بایـەخی مێینە دەردەکەوێت، کە ئەرەستۆ بە روونیی رۆڵی ئەوی دیاریکردووە. ئەگەر وەزیفەی کۆیلە جێبەجێکردنی داواکارییەکانی خێزان و دابینکردنی پێویستییە رۆژانەییـەکانی بێت، ئەوا وەزیفەی یەکەمی مێینە بریتییە لە وەچەخستنەوە یان منـاڵبوون. ئەگـەر دەمانەوێت بە باشی لە رای ئەرەستۆ دەربارەی ژن لە کتێبی (سیاسەت)دا تێبگـەین، پێویستە بگەڕێینەوە سەر نووسینەکانی لە بایۆلۆژیادا.

ئەگەر ئەرەستۆ بایەخی بە پرۆسـەی وەچەخسـتنەوە دابێـت، کـە دەبێتـە هـۆی بەشدارکردنی بوونەوەری زیندوو لە ئەزەلی ئیلاهیدا و نەمریی بـۆ جۆرەکـەی تۆمـار دەکات، ئەوا لە نێو ئەم پرۆسەیەشدا بایەخی بە سێ کێشەی سەرەکی داوە:

١) بەشداریکردنی هەریەکە لە نێر و مێ لە پرۆسەی وەچەخستنەوەدا.

٢)    بەشداریکردن لە دیاریکردنی رەگەزی کۆرپەلەدا.

٣)    ئایا بەشداریکردن بە هەموو جەستە دەبێت یان تەنیا بە ئەندامێکی دیاریکراو.

بە خێرایی باسی هەریەکە لەم خاڵانە دەکەین، چونکە گرنگن بۆ تیشك خستنە سەر سروشتی ژن لای ئەرەستۆ.

# سێیەم
# ڕۆڵی نێر و مێ

لە کتێبی (زاوزێی گیانلەبەران) دا، ئەرەستۆ بەم شێوەیە پێناسەی نێر و مێ دەکات:

(پێناسەی نێر جیاوازە لە مێ، لەبەر ئەو توانا تایبەتانەی هەیـەتی، مەبەسـت لـە نێـر ئەوەیە کە تۆو دەخاتە جەستەی بەرامبەرەوە، مەبەست لە مێینەش ئەوەیە کە تـۆو لـە نێـو جەستەی خۆیدایەتی، ئەم تۆوەش پێشـتر لـە خاوەنەکەیـدا -مەبەسـت پیـاوە- هـەبووە)[88].
پێناسەی لەو شێوەیەش نەك تەنیا ئاماژە بە لایەنی توێکاری تایبەت دەدات، بـەڵکو پلـە و نمرەش لە بووندا دیاری دەکات. چەند (توانایەکی تایبەت) لای پیاو هەن کە ژن نییەتی، بۆیە ڕۆڵی تایبەتییان لە پرۆسەی وەچەخستنەوەدا دەبێت و وەزیفەشیان جیاواز دەبێـت. لێـرەوە و بەردەوام بە چەند شێوەیەك، نێرینە بەرزتر و بە بەهاترە لە ژن[89]. با سەیرێکی بەشداریکردنی هەردووکیان بکەین لە وەچەخستنەوەدا، بەو مەرجەی ئەو کلیلە سەرەکییانەمان لە زیهندا بێت کە باسمانکرد. ئەوانە بنەڕەتی میتافیزیکیی تیۆرەکەن، هەر وەك بنەڕەتی دروستبوونی هەموو گەردوونیشن. لەوانەش بۆ نموونە بیرۆکەی هیرارکییەت یان پلەبەندیی، هەروەها ئەو بیرۆکەیەی پێی وایە هەموو دونیا لە هەیولا و فۆرم پێکهاتووە، فۆرمیش (لەبەر ئەوەی رۆحە، بـاڵاتر و گرنگتر دەبێت لە هەیولا کە مادەیە). ئـەم بیرۆکانـە هـەموویان هـەن، بـەڵکو بنـەڕەتین لـە بایۆلۆژیادا.

وەك بینیمان سێ جۆر وەچەخستنەوە (لە دایکبوون) هەن: خود بە خود، لە یەك باوانەوە (وەك لە ڕووەکدا) و لە دایك و باوکێك. بەڵام بە رای ئەرەستۆ باشتر وایە رەگەزی باڵا (نێرینە) لە رەگەزی نزم (مێینە) جیا بێتەوە. ئەگەر فۆرم وەك باسکرا، باشتر بێت لە هەیولا یان مادە و زیاتر ئیلاهیانە بێت، ئەو کات باشتر وایە، هێندەی دەکرێت، نێرینە لە مێینە جیا بێتەوە[90].

دەڵێت: لە هەموو گیانلەبەرانی جووڵاودا، نێر لە مێ جیا دەبێتەوە، تا یەکێکیان ببێتـە نێر و ئەویتریان بە مێ، هەرچەندە سەر بە هەمان جۆریش بن. بۆ نموونە دەوترێت: پیـاو و ژن

هەردووکیان مرۆڤن، ئەسپ و ئێستریش هەردووکیان گیانلەبەری سوارین و...هتد. بـەڵام لـە رووەکدا ئەم دوو هێزە تێکەڵ دەبن و لە یەکتری جیانابنەوە، بۆیە بە خۆیـان وەچـەدەخەنەوە و سپێرمیان نییە، بەڵکو تۆو (بذور) یان هەیە[٩١].

جارێکی تریش دەبێت بزانین، دیدی میتافیزیکانەی ئەرەستۆیی لێرەشدا زاڵە، واتە بیرۆکە میتافیزیکییەکەی دەهێنێت و بە سەر ئەو بابەتانەی لێیان دەتوێژێتەوە، پراکتیکی دەکـات. ئەگەر لـە گـەردوون و سیاسـەت و کۆمەڵگاشـدا هیرارکییـەت هـەبێت، لـە بایۆلۆژیاشـدا هیرارکییەتێك هەیە، واتە ریزبەنـدیی سـەرەو ژوورانـەی ژیـان. (واتـە سروشـت بـەرە بـەرە هەڵدەکشێت، لە شتە بێ گیانەکانەوە بەرەو بوونەوەرە زیندووەکان یان ژیانی گیانلەبەران، بـە جۆرێك ئەستەمە هێڵی جیاکەرەوەی ورد دابنێی. بەڵام بە شـێوەیەکی گشـتی لـە سـەرووی شتانی بێ گیانەوە، رووەك دێت، جۆرەکانی رووەکیش بە پێی گەرمیی نێویان جیاوازن. ئەگەر رووەك بە بەراورد بە گیانلەبەران بە نازیندوو بێتە ژماردن، کەچی بەراورد بـە بـێ گیانـەکان زیندوون. ئاشکرایە پلەبەندییەکی سەرەو ژوورانە هەیە لە رووەکەوە بەرەو گیانلەبەر...)[٩٢].

لە جیهانی گیانلەبەراندا و لەنێو هەر جۆرێك گیانلەبەردا، ئەرەستۆ جیاوازی لە نێوان نێر و مێدا دەکات، رای وایە مێینە هەڵگری وەچەیە، یاخود لە ناویدا وەچە گەشە دەکات، بۆیـە لە زەوی دەچێت. رەنگە ئەمەش بێت هۆکاری ئەوەی شاعیران بە زەوی دەڵێن (دایـك) و بـە ئاسمانیش (باوك). ئەرەستۆ پێی وایە نەفس (یان رۆح) هێزی ژیانە و لە بوونەوەرە زیندووەکاندا بنەڕەتە[٩٣]، لەبەر ئەوەی جۆری بوونەوەرە زیندووەکان سیانن، بە دواشـیدا جـۆری نەفسـەکان سیان دەبن: نەفسی هەناسەدەر، بەرپرسە لە پرۆسەی خواردن و لـە رووەکـدا هەیـە. نەفسـی هەستکەر، کە لە گیانلەبەردا هەیە، پاشان نەفسی ئاقڵ، کە لە مرۆڤـدا هەیـە. نـەفس لـە هەموو حاڵەتەکاندا هۆکار و بنەمای جەستەی زیندووە، هەر ئەویش جەوهەری جەستە هەناسە دەرەکانە، مادام هۆکاری هەر شتێك جەوهەری ئەو شتەیە[٩٤].

ئێستاش دەگەینە رۆڵی هەریەکە لە نێر و مێ لە پرۆسەی زاوزێدا. ئەرەستۆ پێیوایە رۆڵی گەورە و یەکلاکەرەوە، رۆڵی نێرینەیە، کە فۆرم یان هۆکارە و بنەمای ژیان (ڕۆح) و نەفس بە کۆرپەلە دەبەخشێت. لە کاتێکدا مێینە تەنیا هەیولا یان مادە دەبەخشـێت، کـە خـۆی لـە

خوێنی سوری مانگانەدا دەبینێتەوە. ئاوەها دەبینین رۆڵی ژن لە زاوزێدا، بریتییە لە بەخشینی مادەی پرۆسەکە، کە لە خوێنەکەدایە. نێرینە فۆرم و جووڵەمان پێدەدات، مێینەش جەستەی هەیولا[٩٥].

ئەم بیرۆکە ئەرەستۆییە کە رۆڵی ژن لە کاری زاوزێدا، تەنیا بە دانی خوێن (ئەو مادەیەی کۆرپەلەی لێ دروست دەبێت) دیاری دەکات، سەردەمانێکی زۆر بە سەر بـیری مرۆڤایەتیـدا زاڵبوو، بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی بە سەردا بێت، یان تەنانەت گومانیشی لێبکرێت. ئـەوەی سەیرە ئەم بیرۆکەیە لە سفری حیکمەتیشدا هەیە (کە حیکمەتی سولەیمانیشی پێدەڵێن). لـەم سفرەدا دەڵێت: (...لە ماوەی دوو مانگدا دروستبوو، لە خوێن و تۆوی پیاو و ئـەو لەزەتـەی لەگەڵ خەوتندا دێتە ئاراوە). (ئیسحاحی حەوتـەم: ٢). هـەروەها لـە کتێبـەکانی (زانسـتی زاوزێ)شدا هەیە، کە لە سەروبەندی سەدەی شانزەدا نووسراون. وەك کتێبـی (سـکپڕی و لـە دایکبـوون)ی یـەعقوب رۆیـڤ سـاڵی ١٥٥٤ ز. کـەس بـە شـێوەیەکی یەکلاکـەرەوە هەڵینەوەشاندەوە، تا ولیام هارڤی لە کتێبەکەیدا دەربارەی زاوزێی گیانلەبەران ساڵی ١٦٥١ ز، کردی. ئەمەش پاش توێ توێ کردنی کۆمەڵێك ئاسکی مێینە کە لە باخچەکەی پادشا شارلی یەکەمدا هەبوون[٩٦].

ئەو قسانەی پێشوو، بە رای ئەرەستۆ، تیشکی زۆر دەخەنە سەر رۆڵ و دۆخی ژن لە رووی بایۆلۆژییەوە. سەرەڕای ئەوەی ژن بە هیچ سپێرمێك بەشـداری ناکـات، بـەڵام بـەو رەگـەزە بەشدارە، کە شلەی خوێنی لێ دروست دەبێت، یـان رەگـەزێکی هاوشـێوەی ئەمـە کـە لـە گیانلەبەرە نازیندووەکاندا هەیە.

ئەگەر لە گۆشەیەکی تیۆرییەوە سەیری بابەتەکە بکەین، هەمان شـت دەبیـنین. لێـرەدا تێدەگەین، کە پێویستە کەسێك هەبێت وەچە دروست بکـات و کەسـێکیش وەچـە بخاتـەوە، تەنانەت ئەگەر ئەم دووانە لە یەك شتدا کۆببنەوە، هەر دەبێـت لـە جـۆردا جیـاواز بـن. لـە گیانلەبەرانیشدا کە ئەم دوو سیفەتە جیاوازن، جەستەی بەشداریکەری ئیجابی (پـۆزەتیڤ) و جەستەی بەشداریکەری سەلبی (نێگەتیڤ) دەبێت جیاواز بن. هەروەها ئەگەر نێرینە ئیجابی بێت، ئەوا ئەو جووڵە دەخولقێنێت، کەچی مێینە لەبەر ئەوەی سەلبییە، ئەوەی بەشداری پـێ

دەکات و پێشکەشی کۆرپەلەی دەکات، نابێت سپێرم بێت، بەڵکو مادەیە. لە راستیدا هەر ئەمەشە روو دەدات، چونکە رەگەزی سروشتی شلەی خوێنەکە، مادەی سەرەتاییە[97] لەم دەقەوە چەند تێبینییەك دێنە پێشەوە:

یەکەم: ئەرەستۆ هەر لە سەرەتاوە گریمانی بوونی فۆرم و مادە دەکات لە بواری بایۆلۆژیادا و دەست دەکات بە گەڕان بە دوایاندا.

دووەم: ئەو قسەیەی ئەپیکۆرییەکان رەت دەکاتەوە، کە دەیانوت ژن بە سپێرم بەشداری دەکات.

سێیەم: پیاو دەکاتە فۆرم و ژنیش بە مادە یان هەیولا. هەروەها پیاوەکە ئیجابی و چالاکە و جووڵە و ژیان بە مادە دەبەخشێت، بەڵام ژن لایەنی سەلبی و وەرگرە و رۆڵی تەنیا بەخشینی شلەی خوێنەکەیە.

چوارەم: مادام پیاو چالاك و ئەکتیڤە، ئەو جووڵە دروست دەکات (واتە هۆکاری جووڵەیە). ژنیش مادام سەلبییە، ئەوا جووڵەی لە سەر دەکرێت.

پێنجەم: (سروشت هەر کارێکی دەیکات، بەوپەڕی دەست رەنگینییەوە کار لە هەموو وردەکارییەکاندا دەکات، رێك بەو شێوەیەی کە ئەقڵ لێی چاوەڕێ دەکات)[98].

لە هەموو ئەمانەوە ئەرەستۆ دەگاتە ئەم دەستەواژەیە:

کەوابێ دەتوانین بڵێین:

١)پیاو بە سروشتی خۆی هۆکار یان بنەمایە.

٢)پیاو پیاوە لەبەر توانا تایبەتەکەی، ژنیش ژنە لەبەر نەتوانینە تایبەتەکەی.

٣)خاڵی جیاکەرەوە، کە توانین و نەتوانین دیاری دەکات ئەوەیە، کە ئەو بوونەوەرە لە ئامادەکردنی خۆراکی کۆتاییدا کاریگەرە یان نا.

٤)هۆکاری ئەمەش لە (بنەما)، واتە لەو بەشەی جەستەدایە، کە گەرمیی سروشتیی تێدایە[99].

## چوارەم
## دیاریکردنی ڕەگەزی کۆرپەلە

پیاو، ڕۆح یاخود فۆرم بە خوێن، کە وەك مادەیەکی مردوو وایە دەبەخشێت. لێرەوە پیاو بە وەزیفەی هۆی کارا هەڵدەستێت. ژنیش تەنیا هەیولا دەبەخشێت (خوێنی ژن وەك سپێرمی پیاو وایە، مەبەستمان لەو خوێنە زیادەیەیە، کە ژن لەبەر کەمی گەرمییەکەی، نەیتوانیوە کارێك بکات سپێرمی بە سەردا بچەسپێت، چونکە ئەم سپێرمەش فۆرمە، بۆیە بە وەزیفەی هۆی ئامانجەکی یان فۆرمی لە منداڵدا هەڵدەستێت. لە کاتێکدا خوێنی ژن تەنیا هۆی مادییە. ڕەگەزی نێر کار لە ڕەگەزی مێ دەکات، بە هەمان ئەو شێوەیەی کە هەوێن کار لە ماست دەکات، ئەمەش بەراوردێکە لە نێوان شتێکی سروشتی و شتێکی دەستکرددا)[١٠٠].

دەبێت لەوە ئاگاداربین، کە سپێرم شتێکی مادی نییە، تا لەگەڵ خوێنی ژنەکەدا تێکەڵبێ و کۆرپەلە پێکبهێنێت، بەڵکو فۆرم یان ڕۆحە. کاتێك پیاو ئەم سپێرمە دەکاتە جەستەی ژنەوە، لە ڕاستیدا شتێکی مادی پێنادات تا ببێتە بەشێك لە کۆرپەیەکی داهاتوو[١٠١]. ڕێك وەك ئەوەی کاتێك دارتاش مێزێك دروست دەکات، شتێکی مادی ناخاتە سەر ئەو مادەیەی کە کاری لە سەر دەکات، کە ئەویش تەختەیە. بەڵکو لە ڕێگەی ئەو جووڵانەوە، کە ئەنجامیان دەدات شێوەیەك (فۆرمێك) بەو مادەیە دەبەخشێت، بە دەستەکانی ئامێرەکە دەجولێنێت، ئامێرەکانیش مادەکە دەجولێنن و...هتد. لە ڕاستیدا ئاگاداریی ئەو لە هونەرەکەی، یان ڕۆحی هونەرەکەی کە فۆرمە، وای لێ دەکات دەستی یان هەر ئەندامێکی تری بە جۆرێکی دیاریکراو بجووڵێنێت. ئەم جووڵەیەش بە پێی گۆڕانی ئەو بابەتەی کاری تێدا دەکات، دەگۆڕێت. هەر بەم جۆرەش سروشت ئەم سپێرمە بەکاردێنێت لەو گیانلەبەرانەی کە نێرینەیان سپێرمی هەیە، وەك ئامرازێکی خاوەن جووڵە، بە هەمان شێوەی ئەو ئامێرانەی کە

لە هەر هونەرێكدا بەكاردێن. ئەمەش ئەو رێگەیەیە كە نێرینــە بەشـدار دەبێـت لــە پرۆسەی زاوزێدا[١٠٢].

پێش ئەرەستۆش هۆكارەكانی دیاریكردنی رەگەزی كۆرپەلە قسـەیان لــە بـارەوە كرابوو، ئەمیش لای خۆیەوە لە كتێبی (زاوزێی گیانلەبەران) دا باسـی ئـەو رایانــەی كردووە. دەڵێت: (را جیاوازییەكی زۆر هەیە لە سەر ئەوەی ئایا كۆرپەلە نێـر دەبێـت یان مێ، لەگەڵ ئەوەی ئایا ئەم جیاوازییە لە مناڵداندا دیاری دەكرێت یان پێش ئەوە. ئەنكساگۆراس - لەگەڵ هەنـدێك لــە سروشـتگەراكانی تـردا- پێـی وایـە رەگــەزی كۆرپەلە، هەر لە سەرەتاوە لە نێو سپێرمەكاندایە، چونكە سـپێرمەكان لــە پیـاوەوە دێن، كەچی ژن شوێنی سپێرمەكە ئامادە دەكات و دەسازێنێت. ئەگەر نێرینە راسـت بێت و مێینەش چەپ، هاوكات كۆرپەلەش نێـر بێـت، ئـەوا دەكەوێتـە لای راسـتی مناڵدانەوە. كەچی ئیمپادۆكلیس پێی وایە رەگەزی منداڵ لە نێـو مناڵدانـدا دیـاری دەكرێت، ئەگەر مناڵدان گەرم بێت، ئەوا بەرهەمەكەی نێر دەبێت، ئەگـەر ساردیش بێت، بەرهەمەكەی مێ دەبێت. هۆكاری ئـەم سـاردی و گەرمییـەش بـە كاریگـەری خوێنەكە دەبێت، بە پێی ساردی و گەرمی و كۆنی و تـازەیی. دیمۆكریتۆسـیش پێـی وایە، رەگەزی كۆرپەلە لە مناڵداندا دیاری دەكرێت، بەڵام نەك بە گـوێرەی سـاردی و گەرمی، بەڵكو بە كاریگەری بڵاوبوونەوەی شلەی هەردوو كەسەكە و..هتد)[١٠٣].

ئەرەستۆ پێی وا نییە كەسانی پێش خۆی بە باشی لە مەسەلەكەیان كۆڵی بێتەوە، یان وەك پێویست لە راستی نزیك بووبێتنەوە، بۆیە تیۆرەكەی خـۆی دەخاتـەڕوو كـە لەوان زیاتر قەناعەت پێكەرە. بە پێی ئەم تیۆرە، وەك بنەما، رەگەزی كۆرپەلــە لــەو ساتەدا دەبێت كە جووتبوون روو دەدات. دواتریش ئەندامە سێكسییەكانی كۆرپەلــە، بە پێی پێویستی ئەو بوونەوەرە زیندووە بەم ئەندامە یان بەوی تر دروست دەبن[١٠٤].

لە سەر چەند بنەمایەكی هاوشێوە، ئەرەستۆ لێكدانەوە بـۆ رەگــەزی كۆرپەلــە و خەسڵەتەكانی بۆماوەش دەكات. ئەگەر نێرینە بە تەواوی بە سەر مێینەدا زاڵ بێـت، كۆرپەلە نێر دەبێت. ئەگەر خوێنی ژنەكە بە باشی ئامادەكرابێت، ئەوا لــە ئــەنجامی

کاریگەری پیاوەوە، شێوەی کۆرپەلە لە باوکی دەچێت. ئەگەر ئەم کاریگەرییەش زۆر بێت، ئەو کات کۆرپەلە نێر دەبێت و لە باوکیشی دەچێت نەك دایکی[105]. ئەگەر نێرینە رەگەزی زاڵ بێت، بەلاّم ئەو جووڵەیەی دەیکاتە سەر ژنەکە، بە پێی کاردانەوەی ژنەکە بگۆڕێت، ئەو کات منداڵەکە لە باپیری دەچێت، نەك لە باوکی. ئەگەر ئەم گۆڕانەش گەورە بێت، منداڵەکە لە باپیرانی باوکی دەچێت. ئەگەر نێرینەش زاڵ بێت وەك تاکێك نەك وەك نێرێك، ئەوا کۆرپەلە مێ دەبێت، بەلاّم لە باوکی دەچێت[106].

ئەگەر مێینە زاڵ بێت، کۆرپەلە مێ دەبێت و لە دایکیشی دەچێت. بەلاّم ئەگەر رەگەزی مێ زاڵ بێت، کەچی ئاڕاستەی خۆی بگۆڕێت، ئەو کات کۆرپەلە مێ دەبێت و لە باپیرانی دایکی دەچێت[107].

لە هەموو حاڵەتەکاندا پیاو فۆرمان پێ دەدات، ژنیش مادە یان هەیولا، کە ئەو فۆرمەی بە سەردا دەچەسپێت. زۆر جاران ئەم مادەیە بە باشی ئامادە نییە، بۆیە چەسپاندنەکەش بە باشی نابێت. لێرەوە ئەرەستۆ بە توندی نکۆڵی لەوە دەکات، کە ژن جگە لە مادە هیچ شتێکی تر بە کۆرپەلە ببەخشێت. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دیدی ئەپیکۆرییەکان رەت بکاتەوە، کە پێیان وابوو ژن بە سپێرم بەشداری دەکات، بۆیە دەبینین چەند جارێك جەخت لەوە دەکاتەوە، کە ئەمە تیۆرەیەکی شکست خواردووە. دەڵێت: بە روونی بۆمان دەردەکەوێت بەشداریکردنی ژن لە پرۆسەی زاوزێدا، بریتییە لەو مادەیەی لە پرۆسەکەدا بەکاردێت، ئەمەش تەنیا لە خوێنی دایە.

هەندێك رایان وایە ژن لە کاتی جووت بووندا بە سپێرم بەشداری دەکات، ئەمەش بە هۆی ئەوەی هەندێکجار هەست بە جۆرێك لە چێژ دەکات، کە دەشێت بەراوردی بکەین بە چێژی پیاوان. هەروەها لە کاتی کاری سێکسیدا شلەیەك (مادەیەکی لینج) دەر دەدات، بەلاّم ئەمەیان لای هەندێك لە ژنانە نەك لای هەموویان[108]. ئەمەش بە گشتی لای ئەو ژنانەیە کە پێستیان تەنك و ناسکە و

خاوەنی مۆرکێکی مێینایەتی رەسـەنن، لای ئەوانـەیان نییـە کـە پێسـتیان زبـرە و دیمەنێکی پیاوانەیان هەیە[١٠٩].

ئەرەستۆ کە ئەم هەوڵە بۆ هەڵوەشـاندنەوەی ئـەم بیرۆکەیـە دەدات، بـۆ ئەوەیـە بەرگری لە تیۆرەکەی خـۆی بکـات، کـە پێـی وایـە ژن تـەنیا بـە خـوێن بەشـداری دەکات[١١٠]، ئەم خوێنەش مادە یان هەیولایە کە کۆرپەلەی لێ دروست دەبێت، کە لە پرۆسەی زاوزێدا ئاستی لە فۆرم کەمترە (چونکە هەمیشە فـۆرم لـە مـادە بـاڵاترە). کەچی سپێرمەکان فۆرمن، بۆیە رەگەزی باڵا و پیرۆزترن، چـونکە رۆح یـان بنـەمای ئەقڵی بە کۆرپەلە دەبەخشن و سەرچاوەی ژیان و بزووتنن. جا کەوابێ چـۆن دەشـێت مێینە سپێرمی هەبێت، لـە کاتێکـدا بوونـەوەرێکی نزمـە؟ ئایـا ئەمـە تێکـدان و شێواندنی ریزبەندیی هەبووەکان و سیستەمی هیرارکییەتی گەردوون نییە؟ لە راستیدا هەر ئەم سیستەمەیە لای ئەرەستۆ، تەفسیری هەموو شتێك دەکات، لـە ناویشـیاندا پرۆسەی زاوزێ، کە تاکە پاساوی بوونی ژنە. ژن بوونەوەرێکە بـێ توانـا، پـڕ کـەمو کورتی، نزم و پاسیڤ، بۆیە دەبێت گوێڕایەڵ بێت. بەڵام پیاو ئەکتیڤە، چالاکە، بـەرز و باڵایە، بۆیە دەبێت فەرماندەر بێت و حوکم بکات و بیر بکاتەوە، گفتوگـۆ بکـات، بۆچوون دروست بکات و بیانوو بهێنێتەوە، بۆیە مرۆڤێکی رەسەنە. بە تایبەتی پیاوی یۆنانی ئازاد، بەو شێوەیەی پاش کەمێك لە باسی سیاسەتدا بۆمان دەردەکەوێت، ئەم نەك تەنیا شیاوە بۆ حوکمکردنی ژن، بەڵکو بۆ حوکمی هەموو مرۆڤایەتیش. ژنـیش هێندە بەسە شانازی بەوەوە بکات کە رۆڵی دەفر یان هەڵگرێکی پاسیڤ ببینێت، کـە یارمەتی و کار ئاسانی بۆ پیاو دەکات تا منداڵی ببێـت. ئەگـەر ئێسـتا بـە وردیـی پرسیار لە رۆڵی دایك و باوك بکەین لە دیاریکردنی رەگـەزی کۆرپەلـەدا، وەڵامەکـە ئەوە دەبێت: ئەرەستۆ بە شێوەیەکی زۆر هەش و ناڕوون باسی رۆڵـی دایـك و بـاوکی کردووە، ئەو رەگەزەی ئەرەستۆ ددانی بە رۆڵەکەیدا نـاوە، پیـاوە، چـونکە ژیـان بـە کۆرپەلە دەبەخشێت، ئەمەش کاتێك (ڕۆح)ی پێ دەبەخشێت کە هۆکارە بـۆ بـوونی،

بەڵام ژن وەك وتمان، رۆڵی تەنیا بریتییە لە بەخشینی جەستە یان مادە بەو ژیانە تازەیە!

سەرەڕای ئەوەش وەزیفەی بنەڕەتی و کاملّی زاوزێ، هێنانی منداڵێکە لە باوکی بچێت نەك دایکی، لە خەسڵەتە سێکسییەکانی و ئەوانی تریشدا. هەر لادانێك لەم وێکچوونە (وێکچوون بە باوك) کەموکورتییە[111]. لێرەوە ئەرەستۆ دەڵێت: (ئەو منداڵەی لە دایك و باوکی ناچێت، بە شێوەیەك توشی شێواویی خەڵقیی Monstrosity بووە، چونکە سروشت لەم حاڵەتەدا لە ئیدیاڵەکە لایداوە.

لە راستیشدا یەکەم لادان ئەوەیە منداڵەکە مێ بێت نەك نێر، هەر چەندە ئەمەش زەرووورەتێکی سروشتییە، چونکە ئەو گیانلەبەرانەی کە دوو رەگەزن دەبێت بمێننەوە، هەروەها لە هەندێك حاڵەتدا نێر ناتوانێت بە سەر مێدا زاڵ بێت، بۆیە پێویستە گیانلەبەران مێینەش بخەنەوە. ئاوەهاش شێواوی خەڵقیی (مەبەست خستنەوەی مێینەیە) هەر چەندە زەرووورەتێکی خۆ بە خۆیانە نییە، لەگەڵ ئەوەشدا رووداوێکی پێویستە[112].

راستییەکەی لێرەدا دژیەکییەك هەیە، سەرەڕای ئەوەی کاری سروشتی لە زاوزێدا، وەك وتمان، ئەوەیە تاك تاکێکی تری هاوشێوەی خۆی بخاتەوە، کەچی وەزیفەی کاملّی ژن خستنەوەی منداڵێکە لە مێرد یان لە پیاو بچێت، ئەمە یانی چی؟ مانای وایە خستنەوەی نێرێنە، بە یارمەتی نێرینە، نیشانەی سەرکەوتن و کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی تەواوی نێرینەیە. بۆیە دەڵێت: (هێرکولیس لە ناو حەفتا و دوو منداڵدا، تەنیا یەك کچی هەبوو)[113].

لایەنێکی دیاری گەورەیی و پیاوەتی هێرکولیس ئەوەیە، کە دەیان کوڕی هەبوو، کەچی تەنیا یەك کچی هەبووە، چونکە خستنەوەی کچ نیشانەی سەرکەوتن نییە. تەنانەت خستنەوەی مێینە لە لایەن مێینەوە، نیشانەی لاوازییە، هۆی ئەمەش نەبوونی رێکخستنێکی باش یان خۆ ئامادەکردنێکی باشی خوێنی ژنەکەیە. لە لایەکی تریشەوە، خستنەوەی نێرینە بە یارمەتی مێینە، مایەی شانازی و شکۆی ژن

نییه، به هۆی بیرۆکەی ئەرەستۆ دەربارەی بوونی ململانێ لە نێوان نێر و مێدا لە سەر دیاریکردنی رەگەزی کۆرپەلە. ئـەو دەرەنجامەشـی بـە دەسـتمان دێـت ئەوەیـە، کـە باشترین وەزیفە بریتییە لە هێنانە ئارای دۆخێك، کە رەگەزی نێـر تێیـدا زۆر و بـالا بێت[114].

ئاشکرایە پێـوەری منـاڵبوون بریتییـە لـە خسـتنەوەی نێرینـە، ئـەو تاکانـەی دەیانەوێت بە نەمریی بگەن لە رێگەی خسـتنەوەی تـاکێکی هاوشـێوەی خۆیانـەوە، تەنیا پیاوانن. بەڵام بەشداری ژن تەواو جیـاوازە، چـونکە راسـتییەکەی ئەوەیـە ژن، ئامرازێکە بۆ نەمریی جۆر (نوع)، ئەو بوونەوەرێکی مرۆییە بە بوونی هێزەکـی نـەك بەکردەوە، چونکە بوونی مرۆییانەی بە کردەوەی ئەو کاتێکە، کە سکی بە منداڵێکی نێر هەبێت[115].

# پێنجەم
# چۆنێتیی بەشداریکردن

ئەو کێشە بایۆلۆژییانەی لە سەردەمی ئەرەستۆدا هەبوون زۆرن، لەوانە، وەك باسمان کرد: ئایا نێر و مێ هەردووکیان سپێرمیان هەیە؟ ئەمە ئەگەر بزانین لەو کاتەدا تێگەیشتنێکی ناڕوون و فراوانیان لە سەر سپێرم هەبوو، بەوەی (دەیانگووت) ئەو بنەمایەیە کە دەبێتە هۆی گەشەکردنی کۆرپەلە یان بوونەوەرە زیندووە تازەکە و پێیان دەوت شلەی سپێرم (السائل المنوی).

کێشەیەکی تر چۆنێتی بەشداریکردنی دایك و باوکە: ئایا سپێرمەکان لە دایك و باوك پێکەوە دەردەچن، بەو مانایەی کە ئەرەستۆ ئەم وشەیەی بەکارهێناوە، یان تەنیا لە یەکێکیانەوە؟ ئەرەستۆ پاش خستنەڕووی ئەم کێشەیە بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە:

(گرنگە بزانین ئایا سپێرمەکان لە هەردوو کەسەکەوە دەردەچن، یان تەنیا لە یەکێکیانەوە، لەگەڵ زانینی ئەوەی ئایا لە هەموو جەستەوە دێن یان لە بەشێکی جەستەوە، چونکە ئەگەر ئەم ئەگەرەی دوایی‌یان ڕاست دەربچێت، ئەو کات شتێکی مەعقوڵە گریمانەی ئەوە بکەین، کە لە دایك و باوك پێکەوە دەرناچن)[١١٦].

پێشتر گوتمان کە ئەرەستۆ ڕەتی دەکردەوە ژن سپێرمی هەبێت و پێی وابوو ژن تەنیا مادەمان پێدەبەخشێت. کەوابێ تەنیا کێشەی بەشداریکردن دەمێنێتەوە: ئایا بە هەموو جەستە دەبێت یان بە بەشێك لە بەشەکانی؟ دەوترێ ئەرەستۆ هەوڵیداوە تیۆرەکەی ئەبۆکراتس (٤٦٠-٣٧٧ پ.ز.) هەڵبوەشێنێتەوە، کە زانا و پزیشك بووە و بە باوکی پزیشکیی یۆنانی دادەنرێت. چەندین بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ هەڵتەکاندنی تیۆرەکەی، کە پێی وابوو سپێرم لە جەستەی دایك و باوك پێکەوە دەردەچێت. دەڵێت: (ئەگەر سپێرم لە جەستەی ژنەوە دەرنەچێت، ئەو کات ڕاستە ئەگەر بڵێین لە هەموو

جەستەی پیاویشەوە -وەك گشتێك- دەرناچێت. مادام لە هەموو جەستەی پیاویشەوە نایەت، کەوابێ هەڵە نابێت ئەگەر بڵێین ژن سپێرمی نییە، بەڵکو بە ڕێگەیەکی تر بەشداری لە منداڵ خستنەوەدا دەکات)[117].

بەم شێوەیە دەبینین رای پێچەوانەی ئەمەیان زیاتر پەسەندکراوە: ئەگەر بە راستی سپێرم لە هەموو جەستەوە دروست نەبن، ئەو کات هەر دەبوو لایەکیان (دایك یان باوك) هەیان بێت، تا بوونەوەرێکی نوێ بێتە ئاراوە. بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر لە بەشێك-ئەندامێکی دیاریکراوەوە دەرچێت، دایك و باوکیش دەتوانن بەشدار بن. ئەم تیۆرەی دواتریان زیاتر لەگەڵ بایۆلۆژیای نوێ و سەردەمدا وێك دێتەوە، چونکە نیوەی جینەکان لە باوکەوە دێن لە ڕێگەی سپێرمەوە، نیوەکەی تریش لە دایکەوە لە ڕێگەی هێلکۆکەوە[118].

هەریەکە لە دیمۆکریتۆس و ئەمپادۆکلیس و ئەنکساگۆراس پێیان وایە، سپێرم لە هەموو جەستەوە دەردەچێت. ئەرەستۆش چەندین بەڵگەی بەهێزی دژی ئەم تیۆرەی ئەوان هێناوەتەوە[119]. لە جیاتی ئەوەی بڵێت لە هەموو جەستەوە دەردەچێت، گوتویەتی دەگاتە هەموو جەستەی منداڵەکە. بەڵام هەریەك لە دایك و باوك بە شێوەیەکی تایبەتی جیاواز لەوی تر بەشدار دەبن: مادە و گەشەسەندنی کۆرپەلە لە دایکەوە دەبێت، بەڵام ژیان و چالاکی ئەو مادەیە لە باوکەوە دەبێت. ئەمەش چونکە ژن منداڵی نابێت، تەنیا کاتێك نەبێت، کە پیاوێك لەگەڵی جووت ببێت، ڕێك چۆن دارتاش و ئامێرەکانی نابنە بەشێك لە مادە دروستکراوەکە، ئاوەهاش سپێرمەکان نابنە بەشێك لە ڕژێنەکانی ژنەکە[120]. ئەرەستۆ کە ئەم هەموو هەوڵە دەدات بۆ ئەوەیەتی بیسەلمێنێت ژن لە پرۆسەی زاوزێدا تەنیا بە پێشکەشکردنی مادە بەشدار دەبێت، کە خۆی لە خوێنەکەدا دەبینێتەوە. کەچی پیاو فۆرم یان ڕۆح یان ماهیەت پێشکەش دەکات، هەروەها هەر ئەوە، وەك باسکرا، بە ڕۆڵی چالاك و پۆزەتیڤ هەڵدەستێت و ژنیش بە ڕۆڵی پاسیڤ و وەرگر و...هتد. ئەرەستۆ لە هەموو ئەمانەشەوە دەگاتە ئەوەی ژن، بوونێکی مرۆییانەی پێگەیشتووی نییە، بەڵکو زیاتر

لە منداڵێکی نێرینە دەچێت، یان دەشێت بڵێین، کە کوڕێکی منداڵ لە وێنەدا لە ژن دەچێت. بەڵام ژن لە پیاوێکی بێ توانا یان نەزۆك دەچێت[١٢١]، هەر وەك قەشە تۆمای ئەکوینی (١٢٢٥-١٢٧٤) لە ژێر کاریگەری ئەرەستۆدا گوتی (ژن هەبوویەکی عارز) و پیاوێکی نوقسانە[١٢٢].

دەتوانین هەمان شت دەربارەی پرۆسەی منالْبوونیش بڵێین، پیاو پیاوە لەبەر ئەو توانا تایبەتییەی هەیەتی، ژنیش ژنە لەبەر بێتوانایی تایبەتی خۆی[١٢٣].

هەر چەندە ئەرەستۆ بەو شێوەیە باسی سروشت دەکات، کە هیچ کارێکی بێهودە ناکات، بەو شێوەیە کار دەکات، کە ئەقڵ چاوەڕێیە کار بکات و لە وەستایەکی زرنگ دەچێت و...هتد[١٢٤]، سەرەڕای ئەمانە دەڵێت: دەبێت وەك شێوانێکی خەڵقیی سەیری ژن بکەین، یان تەنیا وەك شێواوێك، هەر چەندە شێوانێکە لە ڕەوی ئاسایی سروشت لایداوە[١٢٥]. دەرکەوتنی ئەم بوونەوەرە شێواو و شازانە لە سروشتدا بە هۆی یەکەم لادان لێك دەداتەوە، کاتێك ژن لە بری پیاو دروستبوو. بەڵام ئەمە زەروورەتێکی سروشتی بوو، بۆ مانەوەی ئەو جۆرەی کە دەبێت بمێنێتەوە[١٢٦]، مادام بوونەوەرە زیندووەکان پێش دەکەون، پێویستە نێر لە مێ جیا بێتەوە، تا هەریەکەیان بوونێکی سەربەخۆی هەبێت و وەك ئەوەی لە ڕووەکدا هەیە نەبێت. بەم شێوەیە تێ دەگەین یەکەم لادان لە سروشتدا ئەوە بوو ژنی لە بری پیاو دروستکرد: سروشت ژن دروست ناکات، تەنیا کاتێك نەبێت کە نەتوانێت پیاو دروست بکات!

کەواتە یەکەم لادان دەرکەوتنی ژن بوو، چونکە بنەڕەت ئەوەیە سروشت پیاو دروست بکات، بەڵام ئەم لادانانە لە کاتی منالْبووندا دووبارە دەبنەوە. ئەگەر پیاو فۆرم بدات و بە سەر مادەیدا بچەسپێنێت، ئەو کات بە زاڵبوونی فۆرم کۆرپەلە نێر دەبێت، بەڵام ئەگەر سروشت لا بدات، وەك ئەوەی پێشتر لە دایکەکەدا کردوویەتی، کۆرپەلە مێ دەبێت!

بە دەربڕینێکی تر: کاتێك کۆرپەلە کوڕ دەبێت، ئەو کات ئەم (ئیمتیاز)ە بۆ باوك دەبێت، کە توانیویەتی ئەو فۆرم یان ڕۆحەی پێشکەشی دەکات، لە ڕێگەی

سپێرمەکانەوە خۆیان بە سەر مادەدا بسەپێنن. کەچی ئەگەر کۆرپەلە کچ بێت، ئـەو کات (شکستەکە) بۆ دایك دەبێت، کە خوێنەکەی بە باشی تێکەڵ و ئامادەنـەکردووە تا فۆرمەکەی لە سەر بچەسپێت. ئەمەش هەمان ئەو تێگەیشتنەیە کە لای خـەڵکی عەوام هەیە. کەچی لێکدانەوەی زانستیی راست، بە تەنیا پیاو بـەرپرس دەکـات لـە دیاریکردنی رەگەزی کۆرپەلە، چونکە ژن ئامادەیی تیایە بۆ منداڵی کـورٍ و کچـیش وەك یەك، چونکە جیناتی ژن هاوشێوەیە و بە پیتی (xx) هێما دەکرێت، کەچی لای پیاو شێوە و قەبارە و پێکهاتەشیان جیاوازە و بە پیتی (xy) هێما دەکرێت[١٢٧].

## شەشەم
## لاوازیی مێینە

کاتێك ئەرەستۆ مشتومڕی لەگەڵ ئەو بۆچوونە فەلسەفییانەدا دەکرد، کە پێیان وابوو ژن سپێرمی هەیە و لە پرۆسەی زاوزێدا بەشداریی پێ دەکات، وەك هەندێك قوتابخانەی فەلسەفیی یۆنانی لەوانەش ئەپیکۆرییەکان بۆیچوون، هەندێك فاکتی گرنگ دێنێت، کە یارمەتیدەرن بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە. (ئەمەش کێشەیەکی پڕ مەترسییە بە رای ئەو، چونکە شکست بە بیرۆکەکانی لە بارەی مادە و فۆرم و دۆخی ژن و پیاوەوە دێنێت. لەوانەش کە دەڵێت: ئەو بوونەوەرەی سروشت کەمترین گەرمی پێ بدات، لاوازترین بوونەوەرە، پێشتریش بینیمان، کە ئەمە خەسڵەتی ژنە[١٢٨]. لە کتێبی (بەشەکانی گیانلەبەر) دا دەڵێت: باشترین گیانلەبەر ئەوەیانە کە خوێن گەرمە، خاوەنی خوێنێکی گەرم و لە هەمان کاتدا بێگەردیشە. چونکە خوێنی لەم جۆرە بۆ زیادکردنی ئازایەتی و زیرەکیی شیاوە. لەم گۆشەیەشەوە دەبینین بەشە بەرزەکان لە بەشە نزمەکان باشترن، هەروەك نێر لە مێ و لای راست لە لای چەپ باشترن[١٢٩].

لە کاتێکدا مەسەلەی رادەی گەرمیی خوێن لای ئەرەستۆ، مەسەلەی چەند راستەقینەیەکی حاشا هەڵنەگرن و ئەو تەنیا دوو پاتی دەکاتەوە، زیادکردنی گەرمییەکە دەبێتە بنەڕەت، چونکە تا زیاتر بێت بەڵگەیە لە سەر تواناکانی نەفس، ئەم ریزبەندییەش لە هێزەکانی نێو نەفسدا، نەك خودی گەرمییەکە، رۆڵی بنەڕەتی لە جیاوازی کردنی نێوانیاندا دەبینێت. پاشان سەرکەوتنی پیاو وێنەی زیادبوونی هێزەکانی نەفس وەردەگرێت، لێرەوە ژن رێك دەبێتە (کەمیی پیاوەتی) و -ئەمەش دەربڕینێکە قەشە تۆمای ئەکوینی دوای ئەرەستۆ وەك خۆی دووبارەی دەکاتەوە- بەردەوامیش دەبێت ئەو راستییە سەیرانەمان لە یاد بێت، کە ئەرەستۆ بێ هیچ

بەڵگە و سەلماندنێك باسیان لێوە دەكات! ژن پیاوێكی بێتوانا یان لاوازە، چونكە ژن كاتێك ژنە، كە لاوازییەكی تایبەتی تێدابێت، واتە ئەو كاتەی ناتوانێت خۆراكی پێویست ئامادە بكات و لە قۆناغەكانی كۆتاییدا بیگۆڕێت بۆ سپێرم[١٣٠]. هۆكاری سەرەكی ئەم تێكەڵكردنەی ئەرەستۆ ئەوەیە، ئەو كات سپێرمەكان نەدۆزرابوونەوە، تەنیا وەسیلەیەك بوون بۆ هێنانی فۆرم، یان شلەیەك بوو بۆ گواستنەوەی رۆح بۆ مادەكە. هەروەها ئەو كات هێلكۆكەش نەدۆزرابوویەوە، كە وەسیلەی سەرەكیی بەشداری ژنە لە پرۆسەی منالبووندا. ئەمانە سەرەڕای ئەوەی بیرۆكە میتافیزیكییەكان بوون، ئەم فەیلەسوفەیان لە توێژینەوەكانیدا ئاڕاستە دەكرد، وایان لێ دەكرد بە دوای هۆكار و بەڵگەكاندا بگەڕێت، كە پشتگیری لە تێڕوانینی پیاوی سەرجادەی یۆنانی بۆ ژن دەكەن!

كەچی لە كتێبی (زاوزێی گیانلەبەران)دا فاكتەكانی تایبەت بە لاوازیی ژن و كەمیی پلەی گەرمییان، شانبەشانی فاكتێكی تر لە فاكتەكانی تێبینیكردن دادەنێت. دەڵێت: رژێنەكانی گیانلەبەری لاواز گەورەترن وەك چەندێتی و كەمترن وەك چۆنێتی. ئەمەش واتە زۆر نزیك دەبێتەوە لە خوێن و زۆر لەو دەچێت، كە ئەمەشیان لای ژن دەبینین. مادام ئەرەستۆ گیانلەبەرانی بە پێی گەرمی ریزكردووە، هەر لە سەرەتاوە پێگەی ژنی دیاریكردووە، لە ریزبەندی جیاوازی گیانلەبەراندا پلەی لە پیاو كەمترە. ئەم نزمییەی ژن لای ئەرەستۆ، یەكێكە لەو خاڵانەی دەبنە سەرەتای زانست و لە سەر روویەك لە رووەكانی ئەزموون و تاقیكردنەوە دادەمەزرێت. ئەركی فەلسەفەی سروشتیش روونكردنەوەی ئەم راستییە زانستییەیە، كە لە ئەنجامی بەڵگەكاری ئەقڵییەوە نەهاتووە[١٣١].

ئاوەهاش ئەرەستۆ دۆخی ئەو كاتەی كۆمەڵگاكەی (مەبەست لە دۆخی خراپی ژنانە) پەسەند دەكات، كە خوو و نەریت سەپاندبوونی. پاشان هەوڵدەدات لێكدانەوەیەكی فەلسەفی بۆ بدۆزێتەوە، بە هەمان شێوەی كە لە بابەتی كۆیلایەتیدا كردی، كاتێك بە بیانووی سوودی زۆری ئەم سیستەمە سەیرەوە بەرگری لێكرد، بەوەی

دەیوت بۆ ئاغا و بۆ کۆیلەش وەك یەك بــە ســودە، ئەمــەش سیســتەمێکە سروشــت سەپاندویەتی کە هیچ کارێکی بێهودە ناکات.

ج. هینیتیکا گالّتە بەم تیۆرەی ئەرەستۆ و لێکدانەوەکەی بۆ دۆخی خراپی ژنــان دەکات، کاتێك بە خەیاڵی خۆی گفتوگۆیەکی ســازکردووە گوایــە لــە نێــوان خــۆی و مامۆستای یەکەمدایە، بەم شێوەیە:

- ژن هاوولاّتی نییە.
- بۆچی؟
- چونکە ژن لە پیاو کەمترە!
- بۆچی؟
- چونکە خالّییە لە بەرزترین فۆرمی ئەقڵی مرۆیی.
- بۆچی؟
- چونکە گەرمی زیندووی پێویستی نییە بۆ کارپێکردنی بالاّترین فۆرمی ئەقڵی مرۆیی.
- بۆچی؟
- چونکە ژن وەهایە: گەرمییەکەی کەمترە لە پیاو، ئەمەشە پێناسەی ژن[١٣٢].

ئەم گفتوگۆ پێکەنیناوییە، وتەکەی بێرنارد شۆ-مان بیردەخاتەوە دەربارەی رەش پێستەکانی ئەمەریکا و تێڕوانینی ســپی پێســتەکان بۆیــان. دەڵێــت: (پیــاوی ســپی پێستی ئەمەریکی، رەش پێست دادەبەزێنێتــە ئاســتی پاککــەرەوەی پــێلاّو، پاشــان ئەنجامگیریی ئەوە دەکات، کە رەش پێست تەنیا بۆ پاککردنەوەی پێلاّو شیاوە)[١٣٣].

## حەوتەم
## ئەنجامەکان

١- ئەرەستۆ کە خەریکی بایۆلۆژیا دەبێت، کۆمەڵێك بنەمای میتافیزیکی لە زیهنی دایە، زیاتر لەوە دەچێت کە ئەمڕۆ پێی دەڵێین گریمانە (الفروض) لەگەڵ جیاوازییەکی بنەڕەتیدا، ئەم بنەمایانە گریمانە نین، بەڵکو چەند راستییەکی جەخت لێکراون، کە بە دوای نموونەی پراکتیکی لە جیهانی واقیعیدا وێڵن. بۆیە ئەم بنەمایانە دەبنە ئاڕاستەکەری بیرکردنەوەی و رێی بۆ رۆشن دەکەنەوە، لەبەر ئەوەیە توێژینەوەکانی دەربارەی هەیولا، فۆرم، وەزیفە، باڵا، نزم و ئەو هیرارکییەتەیە کە ریزبەندی هەبووەکان لە هەردوو جیهانی ئەندامی و نائەندامیدا رێك دەخات، بەو شێوەیەی لە ژینگەی کۆمەڵایەتی و دۆخی باو Status Quoی ئەو کاتەی کۆمەڵگای یۆنانیدا هەبووە.

٢- لێکدانەوەی (فاکتە هەبووەکان) یان (هۆکارەکان) کە دەشێ ببنە (پێشەکی)، لە کاتێکدا ئەو فاکتانەی کە تێبینییان دەکەین دەبنە (ئەنجامەکان)، واتە ئێمە هێشتا لە بایۆلۆژیادا بە دیدێکی فەلسەفی میتافیزیکییەوە لە بابەتەکە دەکۆڵینەوە: (چونکە بنەماکانی زانست لای ئەرەستۆ، بە گوێرەی سیستەمی ئەقڵیی شتەکان دیاری دەکرێن)[١٣٤].

٣- یەکێك لەو بنەمایانەی لە کاتی توێژینەوەکانیدا لە زیهنی ئەرەستۆدا هەبووە، ئەو بیرۆکەیە بوو، کە ئەو کات لە کۆمەڵگای یۆنانیدا باو بوو، سەبارەت بە نزمبوونی ژن، لاوازیی هێزی ئەقڵیی و زاڵبوونی شەهوەت و هەڵچوونەکان بە سەریدا، یان ئەوەی ناوی دەنێت رەگەزی نائەقڵانی لە نەفسی مرۆییدا (بەو شێوەیەی لە بەشی داهاتوودا باسی دەکەین). لەبەر ئەوەشە دەبێت ملکەچی پیاو بێت کە رەگەزی ئەقڵانی هەیە و لایەنی نائەقڵانی کۆنترۆڵ دەکات. ئەگەر وا نییە، ئەی لە کوێوە ئەو

بیرۆکەیەی هێناوە، کە ژن هەیولاییە و پیاویش فۆرم، کـە ئەمـەی دواییـان بـالآتر و کاریگەرترە؟ بۆچی بە پێچەوانەوە نەبێت؟ چ بەڵگەیەکی ئەقڵی هەیە بۆ ئـەوەی کـە پیاو لە پرۆسەی زاوزێدا بە فۆرم بەشداری دەکات کە (ڕۆح)ە، سپێرمەکانیش (مادە) نین، بەڵکو وەسیلەیەکی گواستنەوەن، کـە لـە ڕێگەیانـەوە ڕۆح دەپەڕێتـەوە بـۆ نـاو خوێنی ژنەکە، ئەمەش تا خۆی بـە سـەردا بسـەپێنێت و کۆرپەلـە دروسـت بێـت و دەرکەوێت؟

ڕەنگە بوترێت ئەرەستۆ ماهییەتی سپێرمی نـەزانیوە، ئەمـەش ڕاسـتە، بـەڵام هیچی لە سەر هێلکۆکەش نەزانیوە. کەچی بـە یەقینـەوە و بـە پێـی هیرارکییـەتی گشتی هەبووەکان، دەیزانی کە دەبێت ژن لە پیاو کەمتر بێت، ئەمـەش بیرۆکەیـەکی میتافیزیکییە و هیچ بەڵگەیەکی لە سەر نییە. پاشان هەر دەبێت کەسێك هەبێت نزم و یەکێکیش باڵا، یەکێك ئاغا و ئەویتر کۆیلـە، یـەکێك حـاکم و ئـەویتر مـەحکوم. یەکسانی بوونی نییە، بەڵکو جیاوازییەکی سروشـتی ئاشـکرا هەیـە. لەبـەر ئـەوەی نەریتی یۆنانی وا هاتووە کە ژن نزم و مەحکومە و دەبێت گوێڕایەڵ بێـت و...هتـد. بۆیە ئەو دەبێتە مادە-هەیولا، پیاویش دەبێتە فۆرم یان ڕۆح یاخود بنەمای ئەقڵی.

٤- ئاوەهاش ئەرەستۆ دەگاتە ئەو ئەنجامەی: پیاو چالاك و پۆزەتیڤ و هۆکـاری جووڵەیە و ژیـان بـە مـادە دەبەخشـێت، ژنـیش سـەلبی و وەرگـرە و تـەنیا خـوێن دەبەخشێت و هیچی تر. لەبەر ئەمەش کاتێك دەڕواتە سەر باسی دنیـای سیاسـەت، وەك لە بەشی داهاتوودا باسی دەکەین، لەوێش هەر پیاو پۆزەتیڤە و حـوکم دەکـات، کاروباری سیاسی دەوڵەت و ناوماڵیش بەڕێوە دەبات و فەرمان دەدات، ژنیش تـەنیا گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ هەیە. ئەگەر وابێت، شتێکی لۆژیکی دەبێت، کە لە دنیـای ئەخلاقدا بێدەنگی ببێتە تاج و زینەتی ژن، بەڵام بۆ پیاو وانەبێت.

٥- ئێمە بۆ ئەوەی هەر شتێك لە سەر ژن بزانین: لاوازیی، وەزیفەی، ڕۆڵی، دۆخ و پێگەی و...هتد، دەبێت لە (سروشـتی) تێبگـەین. لێـرەوە بایۆلۆژیـای ئەرەسـتۆ، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە بۆچـوونە سیاسـی و ئەخلاقییەکانییـەوە دەربـارەی ژن

هەیە. ژن هیچ لە سروشتی خۆی تێناگات، چونکە ئەقڵی لەو بابەتە تێناگات و توانای تێگەشتن و بەرگەگرتنی بابەتە تیۆرییەکانی نییە. هەر بۆیە فەزیلەتی بنەڕەتی پیاو ئەوەیە، ژن کۆنترۆڵ بکات و ناچاری بکات گوێڕایەڵی بێت، ئەو پیاوەشی بە چاوی یەکسانی تەماشای ژن بکات یان مامەڵەی لەگەڵدا بکات، ئەوا کارێکی شەرمەزارانە و ئابڕووبەری کردووە.

٦- نەمریی تەنیا بۆ هەمەکییە، ئەستەمە بۆ تاك یان هەندەکیی، کە لە ئەزەلی و ئیلاهیدا بەشداربن. (٤١٥- ب). ئەمەشە ئامانجی زاوزێ، مادام بوونەوەرە زیندووەکان وەك تاك ناتوانن بەشداربن لە نەمرییدا، ناچار هەوڵی خستنەوەی چەند تاکێکی هاوشێوەی خۆیان دەدەن، تا ببنە ئەندام لە جۆرێکی نەمر (نوع خالد)دا. لەبەر ئەوەی باوك رۆح دەبەخشێت، لەولاشەوە وەزیفەی کامڵ و بنەڕەتی زاوزێ خستنەوەی منداڵێکە لە باوك بچێت نەك دایك، ئەو کات هەر لادانێك لەم هێڵە کەموکورتییەکی ئاشکرا دەبێت. (٧٦٧- ب). لە راستیدا لادانی یەکەم ئەوەیە منداڵەکە مێ بێت نەك نێر. (٧٦٧- ب بەرگی یەکەم لە تەواوی بەرهەمەکانی ل ١١٨٧-١١٨٨).

٧- لێرەدا ئەرەستۆ دەکەوێتە دژیەکییەکی سەیرەوە، ئەویش ئەوەیە هەر چەندە رەفتاری سروشتیی زیندەوەران، بۆ ئەوەیە تاکێکی تری هاوشێوەی خۆیان بخەنەوە، تا بەشداربن لە نەمریدا، کەچی وەزیفەی کامڵی ژن ئەوەیە، تاکێکی نێر بخاتەوە کە لە باوکی بچێت، ئەمەش یانی چی؟ مانای ئەوەیە خستنەوەی نێرینە بۆ پیاو، نیشانەی سەرکەوتن و جیاوازییە، وەك لای هێرکولیسی پاڵەوانی ئەفسانەیی دەبینین، کە یەکێك لە نیشانەکانی سەرکەوتن و جیاوازبوونی ئەوەیە حەفتا و دوو کوڕ و تەنیا کچێکی هەبووە. (٥٨٥- ب بەرگی یەکەم ل ٩١٨). بەڵام خستنەوەی مێینە بۆ ژن نیشانەی سەرکەوتن نییە، بەڵکو کەموکورتییەکە لە ئەنجامی تێکەڵنەکردنی باش و نەبوونی ئامادەکاری گونجاو بۆ وەرگرتنی فۆرمەکەوە هاتووەتە بوون. ئاوەهاش ئەرەستۆ دەگاتە ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە، بەوەی وەزیفەی کامڵی ژن خولقاندنی

دۆخێكی گونجاوە، تا رەگەزی نێری تێدا بڵاوبێتەوە و كـار ئاسـانی بكـات بـۆ نـەمر بوونی ئەو رەگەزە[١٣٥]. ئەمەش وای لە لیندا لانج كرد بڵێت: (ئەو جـۆرە تێڕوانینـەی پێویستە گاڵتەی پێبكرێت، ئەم تێڕوانینە پیاوسالارییەیە بـۆ جیهـان)[١٣٦]. مەبەسـت لەو تێڕوانینەیە كە هەردوو وشەی نێر (ذكر) و مرۆڤ (بشر) تێكەڵ و هاومانا دەكات، كە ئەم تێڕوانینە تا ئێستاش ماوە و زانراوە[١٣٧]. بێگومان خوێندنەوە و توێژینەوەمان بۆ مێژووی فیكر، هەمیشە یارمەتیمان دەدات بە سـەر ئـەم تێڕوانینـەدا زاڵ بـین و هەڵیوەشێنینەوە[١٣٨].

٨- دەبێت ئاماژەیەكی خێرا بەوە بكـەین كـە مامۆسـتای یەكـەم زۆر هەڵـەی بایۆلۆژی كردووە. بە رادەیەك وتـراوە: نووسـینە بایۆلۆژییـەكانی ئەرەسـتۆ سـەیرن، تێكەڵەیـەكن لـە وتـی وتـی، تێبینـی كـەموكورت، بیركردنـەوەی هیواخوازانـە و ساویلكەیی و خۆشباوەڕیی[١٣٩]. ئەو بەڵگانە چین كە قەناعەتیان بە ئەرەسـتۆ هێنـاوە بەوەی سپێرمی گەنجانی نێوان تەمەنی باڵغبوون و بیست ساڵی لاوازن (ناپیتن)؟ یـان كوڕان و كچانی گەنج وەچەی نوقسان و بچووكتر لە قەبارەی ئاسایی دەخەنـەوە؟ یـان ئەگـەر لـە مانگێكـدا ژن سـێ جـار كەوتـە خوێنـەوە (حـیض) مانـای هـەبوونی ئارەزوویەكی زۆری سێكسییە؟[١٤٠].

سەرەڕای هەموو ئەمانە، ئەرەستۆ بڕوای تەواوی بە ڕێسای حەوتەوانە (السبعية) هەبوو، كە بە پێی ئەم رێسایە هەموو شتێك لە حەوت خولدا دەسوڕێت: مرۆڤ حەوت تەمەنی هەیە، هەر یەكێكیان حەوت ساڵە[١٤١]. هەروەها ئەگەر كەسـێك بیـەوێت بـە باشی لە سروشت تێبگات، دەبێت بزانێت كە سپێرم لە تەمەنی ١٤ ساڵی (دو خـول) و ٢١ ساڵی (سێ خول)دا لاواز دەبێت، چـونكە پیتانـدن لـەم دوو ماوەیـەدا لەگـەڵ رێسای حەوتەوانەدا دژ دەوەستێت[١٤٢].

جۆرج سارتۆن، هەڵە بایۆلۆژییەكانی ئەرەستۆ لە سێ هەڵەی سـەرەكی و زەقـدا كورت دەكاتەوە، ئەوانیش:

**هەڵەی یەکەم:** هەڵە دەکات کاتێك دەڵێت: لە کاتی سێکسدا پیاو شتێکی مادی بە ژن نابەخشێت، یان کە دەڵێت: سپێرمەکان فۆرم بە خوێنی ژنەکـە دەدەن، سـپێرم مادەیەکی بیٚ شێوەیە و رۆحە، مادە نییە. سروشتیشە، کە ئەرەستۆ ئاگای لە بوونی سپێرمەکان نەبووە.

**هەڵەی دووەم:** هەندیٚ حاڵەتی گیانلەبەرە خەسێنراوەکان سەریان لـیٚ شـێواندوە، بە پێی پێویست لە وەزیفەی گونەکان تێنەگەیشتووە.

**هەڵەی سێیەم:** تایبەتە بە سەری کرمی شریتییەوە[١٤٣]، هـەر چـەندە رەنگـە لـە بابەتەکەمان دەرچین، بەڵام پەیوەندی پێیەوە هەیە، هەڵەی وەهاش زۆرن. دەڵێت: نـە ژن نە منداڵی کورِ، هەروەها کەسێکیش کە خەسـێنرا بێـت سـەریان کەچـەڵ نابێـت (مێژووی گیانلەبەر ٦١٨- أ). بەمەش ژنان بـە کـەم و نـزم دادەنێـت، چـونکە لـە منداڵی بچووك دەچن. هەروەها دەڵیٚ ژن ددانی لە پیاو کەمترە (مێـژووی گیانلەبـەر ٥٠١- ب). بێرتراند راسڵ بە گاڵتە پیٚ کردنێکەوە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: ئەگەر ئەرەستۆ داوای لە ژنەکەی بکردایە بۆ ساتێك دەمی بکاتەوە، هەڵەیەکی وا گـەورەی نەدەکرد. هەروەها وتویەتی: ژن نێرینەیەکە بیٚ ئەندامی نێرینەیی یان ئەندامی زاوزیٚ (٧٢٨- أ). ئەو نێرێکی بە رمووزن بوو و شـێواوە (زاوزێـی گیانلەبـەران ٧٣٧-أ). هەندێك پێیان وایە لەم خاڵەدا و سەبارەت بە لە دەسـتدانی ئەنـدامی نێرینـەیی لای ژنان، پێش فرۆید (١٨٥٦-١٩٣٩) کەوتووە![١٤٤].

## بەشی دووەم
## ژن و سیاسەت

* رەگەزی پیاو لە ژن گونجاوترە بۆ سەرۆکایەتی کـردن، پاشان باڵادەستیی پیاو بە سـەر ژنـدا مەسـەلەیەکی تـەواو سروشتییە..!

ئەرەستۆ: سیاسەت ١٢٥٩-أ

* بێدەنگی تاج و زینەتی ژنە، بەڵام بۆ پیاو وا نییە..

ئەرەستۆ: سیاسەت ١٢٦٠-أ

# پێشەکی

دەبێ ئەوەمان لە بیر بێت، کە فیکری سیاسی ئەرەستۆ، وەك هەمیشە، رەنگدانەوەی دۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و بیروباوەڕە دینییەکانی نێو دەوڵەتە شاری یۆنانی سەدەی چوارەمی پێش زایینە. بۆیە سوزان ئۆکین دەڵێت: (ئەو پێناسەیەی هیگڵ، کە پێی وایە هەموو فەلسەفەیەك هەمان سەردەمەکەی خۆیەتی لە قاڵبی فیکردا[١٤٥]، بە سەر هیچ فەیلەسوفێکدا بە هێندەی ئەرەستۆ، بە خودی هیگڵیشەوە ناسەلمێت)[١٤٦]. لەبەر ئەوە سەیر نییە، ئەگەر مامۆستای یەکەم پێی وا بێت کۆیلایەتی سیستەمێکی سروشتییە، یان کاتێك تیۆرەیەکی تەواو بۆ پاساودانی کۆیلایەتی دادەنێت.

زۆربەی زۆری رۆشنبیرانی ئەو سەردەمەش هەمان دیدیان هەبووە. هەروەها نابێت پێمان سەیر بێت، کە دەڵێت ژیانی وەرزێر و بازرگان و وەستاکان لەگەڵ ژیانی هاوڵاتییە ئازادەکانی نێو شاردا وێك نایەتەوە - ئەمانە سەر بە چینی بەرهەمهێنن، کە پێشتر ئەفلاتون لە شارە یۆتۆپییەکەی خۆی دەریکردبوون- و ناوینـاون جڤاتی شەهوەت، ژیانی نێو ئەم جڤاتە بە ژیانی بەرازەکان دەچوێنێت[١٤٧]. ئەمەش دیدێکی ترە، کە دەربڕی باوەڕی زۆرینەی تیۆریسینە سیاسییەکانی یۆنانە.

هەروەها ئەرەستۆ خۆی زۆر بە گەورە دادەنێت و دژایەتی بەربەر (بیانی)یەکان دەکات. لەمەشدا هەر ئەو باوەڕە باوەی نێو کۆمەڵگای یۆنانی دوو پات دەکاتەوە و سوکایەتی بە خوو و نەریتیان دەکات، بەڵکو راشکاوانە دەڵێت: کە ئەوان هەر بە سروشت کۆیلەن!

لە دواییشدا ئەرەستۆ ژن لە بوارەکانی کولتوور و سیاسەت و ژیانی فیکر بە گشتی دوور دەخاتەوە، لە بەرامبەردا وەزیفەی تەنیا لە منداڵ خستنەوەدا کورت

دەکاتەوە. ئەمەش دیمۆستین بە وتەیەك دەریبڕیوە: (ئێمە سۆزانییەکانمان بۆ چێژ دەوێت...هاوسەرانیشمان بۆ ئەوەی منداڵی شەرعیمان بۆ بخەنەوە...هتد)[١٤٨].

مرۆڤ کە گوێی لەم قسانە دەبێت، ناتوانێت بڵێت ئەرەستۆ بۆچوونی باوی سەردەمی خۆی تێپەڕاندووە، بەڵکو نووسینەکانی بوونەتە چەند پاساوێکی ئەقڵی بۆ چەند بڕیارێکی فەلسەفی پێشینەیی، کە لە قوڵاییەکانی کولتووری یۆنانیدا هەبووە. لەبەر ئەمەیە بڕوای بە جیاوازی نێوان حاکم و مەحکوم، باڵا و نزم هەیە. ئەم جیاوازییەش وەك بەشێك لە سیستەمی سروشتی شتەکان ناو دەبات. هەروەها هەبووەکان، بە پێی توانای نەفس، بە ریزبەندییەکی سەرەو ژووری هیرارکییانە ریز دەکات، رووەك لە خزمەتی گیانلەبەر دایە، ئەویش بۆ خزمەتی مرۆڤ هەیە. لە نێو رەگەزی مرۆیی خۆشیدا دەشێت جیاوازییەکی هاوشێوە لە نێوان حاکم و مەحکومدا بکرێت: یەکەم: لە نێوان نێر و مێدا. دووەم: لە نێوان پیاوی گەورە و منداڵدا. سێیەم: لە نێوان ئازاد و کۆیلەدا[١٤٩].

## یەکەم
## دروستبوونی دەوڵەت

سیاسەت لای ئەرەستۆ زانستی بەختەوەریی کۆمەڵایەتییە، ئەخلاقیش زانستی بەختەوەریی تاکەکانە. بەختەوەریی کۆمەڵایەتیش ئەوەیە، مرۆڤ ژیانێکی چاکەکارانەی هەبێت، ئەم ژیانەش بەدینایەت تەنیا لە سایەی قانون و دادپەروەری و یەکسانیدا نەبێت[150]، ئەوەش پێویستی بە بوونی دەوڵەتە، کە کاملترین گردبوونەوەیە و هەموو گردبوونەوەکانی تر لە خۆ دەگرێت.

ئەرەستۆ بە توێژینەوە لە جۆرەکانی گردبوونەوەی مرۆیی دەست پێ دەکات و پێی وایە خێزان یەکەم گردبوونەوەی سروشتییە. بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەشی وتەیەکی (هزیۆد)ی شاعیر دەهێنێتەوە:

- سەرەتا دەبێتماڵێك ئامادە بکەیت.
- پاشان ژنێك بهێنە.
- لە دواییشدا گایەك بهێنە بۆ کێلانی زەوی و زار[151].

ئەگەر گا لە جیاتی کۆیلە لە خزمەتی خێزانە هەژارەکاندا بێت، ئەرەستۆ لە وتەکەی شاعیرەوە بنەماکانی پێکهێنانی خێزانی کورتکردوەتەوە: پیاو و کۆیلەکەی، پاشان ژن و مێرد، لە دواییشدا منداڵ.

هەر رەگەزێکیش پەیوەندی تایبەتی خۆی هەیە. دەبێت بزانین خێزان یەکەم شێوەی گردبوونەوەی مرۆییە، گردبوونەوەیەکی سروشتییە بۆ پڕکردنەوەی پێویستییە رۆژانەییە دووبارەکان. لە گردبوونەوەی چەند خێزانێکیشەوە شێوەی دووەم پێکدێت، کە گوندە ئەندامانی وەك گرووپێکی نزیك لە یەك مامەڵە دەکەن، بە رادەیەك بە ئەندامانی دەوترێت، کە یەك شیریان خواردووە و کوڕ و کوڕەزای یەکترن[152].

بەڵام گردبوونەوەی کۆتایی و تەواو، کە لە ژمارەیەك لادێ دروست دەبێت، شار یان دەوڵەتە و دەشێ لە بارەیەوە بوترێت: گەیشتوەتە پلەی خۆژیاندن (الاكتفاء الذاتي)ی کامڵ. دەوڵەت ئەو ئامانج یان لوتکەیەیە کە کۆمەڵەکانی تری بەرەو روو دەبزون: سروشتی شتەکانیش وەهایە، کە بگەنە لوتکە یان ئامانجی خۆیان، چونکە هەر شتێك کە گەشەی کامڵ دەبێت پێی دەوترێت سروشتی بوونی ئەو شتە[153]. قەد و گەڵا و لقی دار پرتەقاڵ پێش خودی پرتەقاڵەکە دەکەون، بەڵام پرتەقاڵەکە ئامانج یان لوتکەیە، کاتێکیش تەواو پێ دەگات دارەکە بە ناوی ئەوەوە ناودەنرێت. بە هەمان شێوە دەوڵەتیش، مەبەست و ئامانجی کۆتایی گردبوونەوەی مرۆییە، هەر چەندە لە رووی کاتەوە دوای خێزان و گوند دەردەکەوێت، کەچی ئەو لە پێشترە، چونکە ئامانجی گردبوونەوەکانی پێش خۆیەتی.

ئەرەستۆ لە کتێبی یەکەمی سیاسەتدا پێناسەی دەوڵەت دەکات بەوەی جۆرێکە لە گردبوونەوەی مرۆیی، ئەگەر هەموو گردبوونەوەیەکیش مەبەستی چاکەیەك بێت، ئەو کات دەتوانین بڵێین: دەوڵەت کە لە نێویدا هەموو شێوە گردبوونەوەکانی تر لە خۆ دەگرێت، مەبەستی هەموو چاکەیەکە[154]. پێش ئەوەی رەگەزە پێکهێنەرەکانی دەوڵەت شیبکاتەوە، ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەو ریزبەندییە هەرەمییەی پێشتر بینیمان بە سەر هەبووە سروشتییەکاندا دەچەسپا، پاشان بە وردەکاری زیاترەوە لە بەشی پێشودا لە بواری بایۆلۆژیادا دووبارە بووەوە، ئەو هەرەمە بە ئاشکرا لەو گردبوونەوەیەی پێی دەڵێن دەوڵەت دیارە و هەیە، پێشتر بینیمان، کە لە سروشتدا یەکسانی نییە، بەڵکو چەند پلەیەکی بەرز و نزم هەن، لێرەشدا هەر وایە، هەر کەسێکیش ئەگەر بڵێت یەکسانی هەیە[155] و پادشا و خاوەن خێزان، ئاغا و کۆیلە، ژن و پیاو یەکسانن، هەڵە دەکات و لە وەهمدا دەژی، چونکە پێیان وایە ئەو کەسانە لە رووی چۆنێتییەوە لە یەك جیاوازنین، بەڵکو لە رووی ژمارەی ئەو کەسانەوە جیاوازن، کە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن. ئەگەر مامەڵەی لەگەڵ کەسێك یان چەند کەسێکی کەم هەبوو ئەوا ئاغایە، ئەگەر ژمارەکەش لەوە زیاتر بێت ئەوا خاوەن خێزانە، لەگەڵ

ژمارەیەکی زۆری خەڵکیشدا دەبێتە سیاسی، یان پیاوی دەوڵەت یاخود پادشا. ئەمەش تیۆرێکە ناشێ راست بێت، چونکە لە نێوان ئەو کەسانەدا، وەك ئاماژەمان پێدا، چەند جیاوازییەکی جەوهەری هەن[١٥٦].

ئەمەش مانای وایە ئەرەستۆ، هەر لە سەرەتاوە رایدەگەیەنێت، کە یەکسانی بوونی نییە، بەڵکو جیاوازی جەوهەری یان جۆریی، یاخود سروشتی هەیە، هەر وەك پاش کەمێك روونی دەکەینەوە. ئەو کەسەی ئاغایە، لەبەر ئەوە ئاغا نییە کە پەیوەندی لەگەڵ چەند کەسێکی کەمدا هەیە، بەڵکو هەر بە سروشت ئاغایە. ئەوە سروشتە دیاری دەکات کێ ئاغایە و کێ کۆیلە، کێ حاکمە و کێ مەحکوم، بڕیاریشی گەڕانەوەی بۆ نییە! هەمان ریزبەندی هەرەمی یان هیرارکییەتی گەردوونی، کە لە نێوان هەبووە سروشتییەکاندا هەیە، لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگای مرۆییشدا هەیە، بە هەمان شێوەی سروشت چەندین پلەی جیاواز و بەرز و نزم هەیە. ئەم پلە جیاوازانەش دەستکردی مرۆڤ یان نەریت و لاساییکردنەوە نین، بەڵکو کاری سروشتن، کە هیچ کارێکی نابەجێ و بێهودە ناکات. با لە سەرەتاوە دەست پێ بکەین: ئەو پلانە تەنیا لە نێو کۆمەڵگای مرۆییدا نین، بەڵکو لە نێو قوڵاییەکانی رەگەزی مرۆیی خۆشیدا هەن، بەو شێوەیەی لە بەشی دووەمی تەوەری یەکەمدا ئاماژەمان پێکرد. هیرارکییەتێك لە نێوان خودی گەلانیشدا هەیە، نەك تەنیا لە نێو تاکە گەلێکدا، چونکە سروشت مەیلی بەوەیە کە ئەم جۆرە جیاوازییە لە نێو مرۆڤدا بخولقێنێت. بەوەی هەندێکیان زیرەکییەکی کەم و جەستەیەکی بەهێزیان هەبێت، هەندێکیشیان شیاوی ژیانی سیاسیانە بن، لە کاتێکدا کەسانێك هەن هیچ شتێك لە رێکخستنە سیاسییەکان نازانن و ناشتوانن بزانن، ئەمەش واتە کەسانێك هەن بە سروشت ئازادن و هەندێکیش بە سروشت کۆیلەن[١٥٧]. گەلانی بەستەڵەکی باکور و ئەورووپا ئازان، بۆیە کەس ناتوانێت ئازادییان لێ زەوت بکات، بەڵام هیچ زیرەکییەکیان نییە و لە سیستەمی سیاسی باشیشدا کلۆڵن. لەبەر ئەمەیە ناتوانن دراوسێکانی خۆیان داگیر بکەن. بەڵام رۆژهەڵاتییەکان زیرەك و دەسترەنگینن، کەچی ترسنۆکن، بۆیە هەمیشە

دۆڕاو و کۆیلەی ئەوانی ترن. گەلی یۆنانیش هەردوو خەسڵەتەکەی هەیە: ئازایەتی و زیرەکیش، هەر وەك پێگەیەکی جوگرافی ناوەندیشی هەیە، بۆیە ئازادیی خۆی دەپارێزێت و ئەگەر بێت و یەکگرتووش بن، دەتوانن ئەوانی تر داگیربکەن[١٥٨]. ئەمەش واتە یۆنانی بە سروشتی خۆی ئازاد و ئاغایە، بیانی یان بەربەریش کۆیلەی ئەوانن. بەڵام تاکی یۆنانی نابێت برای یۆنانی خۆی بە کۆیلە بگرێت، ئەمەش هەمان بیرۆکەی گەلی هەڵبژاردەیە (الشعب المختار)، کە ئەرەستۆ بە سەرەتایەکی هەمەکی زەروریی زانیوە و نەیتوانیوە نەریتی سەردەمەکەی خۆی تێپەڕێنێت[١٥٩].

بەم شێوەیەش ئەرەستۆ بیرۆکە میتافیزیکییەکان دەگوازێتەوە نێو سیاسەت، هەر وەك پێشتر لە بایۆلۆژیاشدا کردی. لێرەدا بڕوای بە پلەبەندیی نێو گەلان (یان هیرارکییەتی نێو رەگەزەکان) هەیە. هەندێکیان باڵا و بەرزن وەك یۆنانییەکان، هەندێکیشیان نزمن وەك بەربەرییەکان (کە غەیری یۆنانییەکانن بە شێوەیەکی گشتی). بۆیە کاتێك ئەسکەندەری مەزن رۆژهەڵات داگیر دەکات، ئەرەستۆ نامەیەکی بۆ دەنوسێت و ئامۆژگاری دەکات، کە جیاوازی بکات لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ یۆنانی و رۆژهەڵاتییەکاندا. لەگەڵ یۆنانییەکان وەك سەرکردەیەك مامەڵە بکات، لەگەڵ بەربەرییەکان (ڕۆژهەڵاتییەکان)یشدا وەك ئاغایەك، چونکە ئەوان هەر بە سروشت ملکەچی یۆنانییەکانن[١٦٠].

کەواتە یەکسانی لە نێوان گەل و رەگەزەکاندا نییە، هەندێك بەرز و هەندێکیش نزمن، هەندێك حاکم و هەندێکیش مەحکوم، ئەم خەسڵەتانەش سروشت دیاریکردوون کە هیچ کارێکی نابەجێ و بێهودە ناکات، هەر ئەوە وا دەکات هەندێك جەستەیان بەهێز بێت و شیاوبن بۆ کاری دەستی رۆژانە، وای لە هەندێکیش کردووە کە نەتوانن بچەمێنەوە و کاری دەستی بکەن (چونکە جەستەیان رێکە) کەچی شیاون بۆ کاری باڵاتر و پیرۆزتر[١٦١]. یەکەمیان بە سروشت کۆیلەیە و دووەمیشیان پیاوی بە سروشت ئازادە. ئەگەر خەڵکی لە شێوەی جەستەیاندا جیاواز بن، هەر وەك خواوەندەکان لە شێوەی مرۆڤ ناچن و جیاوازن، ئەو کات روونە، کە هەموومان رازین بەوەی چینی

خوارەوە کۆیلەی چینی سەرەوە بێت. ئاوەهاش بۆمان دەردەکەوێت، کـە خـەڵکی بـە سروشت هەندێکیان ئازادن و هەندێکیشیان کۆیلە. بە گشتی، دۆخی کۆیلایـەتی بـە سود و دادوەرانەشە بۆ هەردوو لایەن (ئاغا و کۆیلە)[١٦٢].

ئەگەر بنەمای نایەکسانی و ریزبەندی هەرەمی لە لایەك، بە سەر هەموو هەبووە سروشتییەکاندا بچەسپێت و لە لایەکی تریشەوە، بە سەر هـەموو رەگـەزی مرۆییـدا بچەسپێت، ئەو کات لە لایەکی سێیەمەوە بـە سـەر کۆمەڵگایـەکی دیاریکراویشـدا دەچەسپێت. کۆمەڵگای یۆنانی، بۆ نموونە، کە بە رای ئەرەستۆ باشترین کۆمەڵگایـە، لە کۆمەڵێك هاوولاتی یەکسان پێك نایەت، کە هەمان ئەرك و مافیان هەبێت، بەڵکو لە پیاوی یۆنانی ئازاد، پاشان ژنی یۆنانی و لە دواییشدا کۆیلە پێکهاتووە.

ئەم پیاوە یۆنانییە ئازادە، نیشانەی مرۆڤی رەسـەنە لای ئەرەسـتۆ، کـە ئەگـەر مامۆستای یەکەم بە درێـژایی قسـەکردنی لـە سـەر مـرۆڤ و سروشـتی مـرۆڤ، وەك باسمانکرد، وشەی Anthropos بەکاردێنێت، کـە وشـەیەکی یۆنانییـە و بـە واتـای (بوونەوەری مرۆیی) دێت، هەر زوو تێدەگەین کە گروپێکی بچـووك لـە یـەك جـۆری رەگەزی مرۆیی ئەم پێناسەیە دەیانگرێتەوە، دیارە ئەویش (پیـاوی یۆنـانی ئـازاد)ە. پێناسە ناودارەکەی ئەرەستۆش بۆ مرۆڤ بەوەی (بوونەوەرێکی ئاقڵە) تەنیا ئەم پیـاوە یۆنانییە ئازادە دەگرێتەوە. قسەکردنیشی لە سەر فەزیلەتـە مرۆییـەکان و ئەوپـەڕی چاکە و بەختەوەریی مرۆڤ و...هتد، تەنیا قسەکردنە لە سـەر ئـەم پیـاوە. هـەروەها قسەکردنی لە بارەی دیموکراسی، سیستەمی فەرمانڕەوایی، دادپەروەری کۆمەڵایـەتی و یەکسـانی، حـاکم و مـەحکوم، هاوڕێیـەتی و دوژمنایـەتی و...هتـد، هـەموویان پەیوەستن بە دیدی ئەوەوە بۆ (پیاوی یۆنانیی ئازاد).

کەچی ژن ئەقڵ و زیرەکی کەمترە (لایەنی نائەقڵانی زاڵە بە سەریدا) وەك پـاش کەمێك زیاتر روونی دەکەینەوە. لە رووی پلە و پێگەشەوە نـزمترە، بـە تـەواوی لـە بوارەکـانی سیاسـەت و کولتـوور دوور خراوەتـەوە. هـەروەها توانـای ئەنجامـدانی

فەزیلەتەکانی پیاوی نییە. بۆیە لە بواری ئەخلاقدا فەزیلەتی تایبەت بە خۆی هەیە و لە پلەیەکی ناوەندی دایە لە نێوان پیاوی یۆنانی ئازاد و کۆیلەدا[١٦٣].

بەڵام کۆیلە، ئەرەستۆ تیۆرەیەکی تەواوی داناوە و تیایدا بەڵگـە دێنێتـەوە، کـە دۆخی کۆیلە (سروشتی)یە و ئەوان بە کۆیلەیی لە دایکبـوون، بگـرە ئـەو دۆخـە بـۆ خۆیان و ئاغاکانیشـیان وەك یـەك بـە سـودە. بـەڵام ئـەم بابەتانـە پێویسـتیان بـە وردکردنەوەی زیاترە. با باسی خێزان بکەین کە یەکەم گردبوونەوەی سروشتییە، یەکەم خانەشە کە بە یەکگرتنی چەند دانەیەکیان گوند دروسـت دەبێـت، پاشـان لەوێشـەوە دەچینە سەر باسی دەوڵەت.

## دووەم

## خێزان و دۆخی ژن

ئەفلاتون داوای هەڵوەشاندنەوەی خێزانی لە نێو چینی پاسەوانەکاندا دەکرد، تا دڵنیا بێت لەوەی (دەوڵەتێکی یەکگرتوو)ی هەیە. نابێت باوك، کوڕ، ژن یان مێرد هەبن، چونکە ئەوان بە هەموویانەوە خێزانێکی گەورە پێکدەهێنن. لێرەوە ژن لە کۆمارەکەیدا وەزیفەیەکی دیاریکراوی نەبووە، بەڵکو کردویەتییە پیاوێك کە جەنگاوەرە، خەریکی ململانێیە، راهێنانی قورسی پێدەکرێت و...هتد. کەچی ئەرەستۆ بە تەواوی ئەم دیدەی ئەفلاتون رەت دەکاتەوە، کە لە سەر زاری سوکراتەوە لە کۆمارەکەیدا دەیخاتە روو. بە شێوەیەکی تایبەتیش سێ رەخنەی سەرەکی لێ دەگرێت:

١- ئەو یەکێتییەی سوکرات باسیکردووە و پێی وابووە ئەوپەڕی چاکەی بۆ شار-دەوڵەت تیادایە و بووەتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزانی تایبەت تا پاسەوانەکان لە خێزانێکی گەورەدا جێگیربن، ئەمە دەبێتە هۆی رووخانی دەوڵەت. ئەرەستۆ لە کتێبی دووەمی سیاسەتدا دەڵێت: خاڵی دەستپێك لای سوکرات ئەوەیە، کە ئامانجی دەوڵەت بەدەستهێنانی زۆرترین رێژەی یەکێتییە بۆ دەوڵەت وەك گشتێك، چونکە ئەمە ئەوپەڕی چاکەیە، بەڵام ئاشکرایە ئەو دەوڵەتەی بەردەوام خەمی یەکبوونیەتی و یەك دەگرێت و یەکدەگرێت، لە کۆتاییدا دەگاتە پنتێك بە تەواوی لەوە دەکەوێت دەوڵەت بێت. دەوڵەت بە سروشتی خۆی لە تاك پێکدێت، واتە لە نێو خۆیدا ژمارەیەکی زۆر ئەندامی تیایە، ئەگەر زۆر پێ لە سەر یەکێتیی دابگرێت، لە کۆتاییدا لە جیاتی دەوڵەت دەبێتە خێزان. دواتریش دەگۆڕێت و لەبری خێزان دەبێتە تاك. هەموومان دەزانین یەکێتیی خێزان زیاترە لە دەوڵەت، تاکیش لە خێزان یەکگرتووترە. واتە ئەگەر بشتوانین ئەو ئامانجە بپێکین، کە ئەفلاتون باسی دەکات،

هەر دەبێت وازی لێبهێنین، چونکە دەبێتە هـۆی رووخـانی دەوڵـەت وەك ئـەوەی کـە هەیە[١٦٤].

٢- رەخنەیەکی قوولٌتری هەیە. ئـەفلاتۆن وەك ئـەنجامێك بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی موڵکدارێتی، خێزانی هەڵوەشاندوەتەوە، چونکە ترساوە لەوەی چـینی پاسـەوانان لـە سەر موڵکدارێتی شتەکان ناکۆکییان تێبکەوێت، یەکێك بڵێـت ئەمـە مـوڵکی منـە ئەوی تر بڵێت هی منە، بۆیە بە پێویستی زانیوە لە هەموو شـتێکدا هاوبـەش بـن، بەڵام موڵکدارێتی تایبەت نابێتە هۆی کێشە و ناکۆکی، بـەو مەرجـەی نـەهێڵین لـە ئاستی خۆی تێپەڕێت، چونکە موڵکدارێتی تایبەت رەنگە ببێتە هۆیەك بۆ زیادبوونی بەرهەم.

٣- بە قوربانیدان بە خێزان و منداڵ و بە هۆی هاوبەش بوونی ژن و منداڵـەکان، توشی چەند کێشە و بەربەستێکی تر دەبین: وەك ئـەوەی کـوڕ سـوکایەتی بـە بـاوکی دەکات بێ ئەوەی پێی بزانێت، چونکە ئەو باوکی هەموانە نەك تاکە کەسێك. مادام پەیوەندییەکانیش نەزانراون، رەنگە باوك کوڕی خۆی بکوژێت، یان کوڕ دایکی خـۆی بکوژێت، یاخود برا کوشتن و هاوسەرگیریی حەرامکراوەکان (زواج المحرمات) و..هتـد زۆر ببێت[١٦٥]. بەم شێوەیەش پەیوەندییە سروشتییەکان و سـۆزداریی نێـو مرۆڤـەکان نامێنن. کەوا بێت خێزان و موڵکداری دوو شتی سروشـتین، نـەك بەرهـەمی خـوو و نەریت یان دۆخە کۆمەڵایەتییەکان بن. هەڵوەشاندنەوەشیان لەگەڵ مەیلی سروشـت و خێری دەوڵەتدا بە گشتی دژ دەوەستێت و شتی وەهاش مەحاڵە.

بە هێزی و لاوازی بەڵگەکانی ئەرەستۆ لە دژی تیـۆرە سیاسـییەکانی ئـەفلاتون هــەر چـۆنێك بێـت، مامۆسـتای یەکـەم پێـی وابـووە، کـە فەلسـەفەی دەوڵـەتی مامۆستاکەی هەڵوەشاندوەتەوە و لە خستنە رووی تیۆرەکەی خۆی لە بارەی خێزانەوە بەردەوام بوو. ئەو زۆری پێ سەیرە، کە دەبینێت ئەفلاتون بۆ ئەوەی بیسـەلمێنێت کـە ژنانیش دەبێت هەمان ئەرکی پیاوانیان هەبێت، چـواندنەکانی (یـان نموونـەکانی) لـە جیهانی گیانلەبەرانەوە وەردەگرێت، بە تایبەتیش دێڵە سەگەکان. مێینەی گیانلەبەران

وەك ژن ئەركی ماڵەوەیان لـە سـەر نییـە[١٦٦]. مـادام خێـزان هەیـە، كـاری ناومـاڵ بنەڕەتێكی سروشتی و پێویستی ژیانی كۆمەڵایەتییە، هەر ئەوەش ئەركی سـەرەكیی ژنانە.

خێزان لای ئەرەستۆ لە ژن و مێرد و منداڵ و هەروەها كۆیلەكانیش پێكهـاتووە، كە بە ئامێری زیندوویان دادەنێ و ئەركیان ئەنجامدانی ئەو كارانەیە، كـە بـۆ پیـاوی ئازاد شیاو نییە بۆ خۆی پێیان هەستێت، پەیوەنـدی نێوانیشـیان پەیوەنـدی ئاغـا و كۆیلەیە. هەروەها پەیوەندییەكی هاوسەرییانە و لە كۆتاییدا پەیوەندییەكی باوكانەش لە نێو خێزاندا هەیە.

# سێیەم

## پیاو و پێگەی لە نێو خێزاندا

### پەیوەندیی ئاغا و کۆیلە:

پیاو سەرۆکی خێزانە، چونکە ئەقڵێکی بە هێزی هەیە و دەتوانێت کاروباری ماڵ و دەوڵەتیش پێکەوە ببات بەڕێوە. وەك ناخودا وایە، سوود لە هەندێك ئامێری بێ گیانی وەك سوکان وەردەگرێت، هەر وەك سوود لە زیندووەکانیش وەردەگرێت، وەك سوود وەرگرتنی لە کاپتنی پێشەوەی کەشتییەکە. هەروەها سەرۆك خێزان بۆ بەدەستهێنانی بژێوی خێزان، سوود لە هەندێك ئامێری زیندووش کە کۆیلەکانن وەردەگرێت، پەیوەندی نێوانیشیان، پەیوەندی ئاغایە بە کۆیلەوە، لە سەر بنەمای هێز دامەزراوە و بەو شێوەیەی، کە هەیە هیچ پەیوەندی بە دادپەروەرییەوە نییە. ئەرەستۆ پێی وایە لەبەر ئەوەی کەسانێك هەن بە سروشت کۆیلەن و کۆیلایەتیش باشتر و دادپەروەرانەترە بۆیان، پەیوەندی ئاغا و کۆیلە بۆ هەردووکیان بە سود دەبێت. مەسەلەکەش هیچ ئاڵۆز نییە، جا فەلسەفییانە لێی بکۆڵێتەوە لە سایەی ئەقڵدا، یاخود ئەزمونگەریانە و لەسایەی فاکتە هەبووەکاندا[١٦٧].

بەم شێوەیە، ئەرەستۆ دۆخی کۆیلایەتی ئەو کاتەی کۆمەڵگای یۆنانی دووپات دەکاتەوە و پاساوگەلێکی ئەقڵیشی پێدەدات، کاتێك دەڵێت: (جۆرێك بوونەوەر هەن، کە هەر لە لەدایکبوونەوە ئەندامەکانی جیاوازن. هەندێکیان بە سروشت حاکم و سەرکردەن و هەندێکیشیان ئامادەی ملکەچین، ئەمانە باشترە کاری سەرکردایەتی بە غەیری خۆیان بسپێرن. ئەگەر مرۆڤ لە نەفس و جەستە پێکدێت، نەفس بە سروشتی خۆی حاکمە و جەستەش مەحکوم)[١٦٨]. هەندێ جار کەسانێك دەبینین، کە تیایاندا

جەستە حوكمی نەفس دەكات، بەڵام وتنی ئەوەی كە نەفس حوكمی جەستە دەكـات، ئەمە ئەو دەسەڵاتەیە كە ئاغا بە سەر كۆیلەدا هەیەتی، رێك وەك حوكمی ئـەقڵ بـە سەر شەهوەتدا. ئەگەر سروشتی و بگرە بـە سـوودیش بێـت بـۆ جەسـتە كـە نـەفس حوكمی بكات، ئەوا سروشتی و بە سوودیشە بۆ لایەنی هەڵچوون، كە ئەقڵ حـوكمی بكات[١٦٩]. دۆخی پێچەوانە یان دژی دۆخی ئاسایی و سروشت ئەوەیە، جەستە حوكمی نەفس بكات. بۆیە ئەگەر كەسێك جەستە بە سەر نەفسیدا زاڵ بوو، مانای وایـە ئـەو كەسە باشتر دەتوانێت كاری دەست یان جەستەیی ئەنجام بدات و باشتر وایە ئاغایـەك حوكمی بكات، چونكە ئەو هەر بە سروشت كۆیلەیە، ئامادەیە تا كەسێكی تر ببێتـە خاوەنی. ئەگەر ئەقڵیشی هەبێت تا ئەوەندەیە كە لەوانی تر تێبگات، هەرچەندە خۆی لە ئەقڵ بە مانا تەواوەتییەكەی بێبەشە. لەمەشدا جیاوازە لە گیانلەبەران كە ئەقڵیان نییە و بە غەریزە كاردەكەن[١٧٠]. بەكارهێنانی كۆیلە زۆر جیاواز نییە لە بەكارهێنانی گیانلەبەرانی ماڵی، ئەمانە هەردووكیان لە دابینكردنـی پێویسـتییە رۆژانەییـەكانی ئاغاكەیاندا بەشدارن[١٧١].

## چوارەم
## پیاو و پەیوەندیی هاوسەرێتی

وەك چۆن سەرۆك خێزان ئاغای کۆیلەکانیەتی، پەیوەندی هاوسەرێتیشی لەگەڵ ژنەکەیدا هەیە، هاوکات لەگەڵ منداڵەکانیشیدا پەیوەندی باوکایەتی هەیە. پەیوەندی بەم دوو لایەنەوە (ژن و منداڵەکان) وەك پەیوەندی لەگەڵ کۆیلەکانیدا (یان پەیوەندی ئاغا و کۆیلە) نییە، پەیوەندی لەگەڵ ژنەکەیدا وەك پەیوەندی بەرپرسانە لەگەڵ هاوڵاتیاندا. کەچی پەیوەندی لەگەڵ منداڵەکانیدا وەك پەیوەندی پادشایە لەگەڵ رەعیەتەکەیدا[١٧٢].

لەبەر گرنگی بابەتەکە دەبێ تاوێك لە سەر هاوسەرگیریی بوەستین، تا رای ئەرەستۆی لەبارەوە بزانین:

### ١- هاوسەرگیریی:

هاوسەرگیریی زەروورەتێك بوو دابونەریت لە کۆمەڵگای یۆنانیدا دەیسەپاند، بۆیە هەندێ لە شارەکان رێگەیان بە پیرەژنەکان دەدا، توندترین سزای ئەو کەسانە بدەن کە سوورن لە سەر ئەوەی هاوسەرگیریی نەکەن: رەبەنی لە شاری سپارتا تاوان بوو، یان لە مافی هەڵبژاردن و تەماشاکردنی کەژاوە گشتییەکان و...هتد بێبەش دەکران[١٧٣].

لای ئەرەستۆش هاوسەرگیریی زەروورەتێکە، هەندێ جار سروشت پێویستی دەکات، هەندێ جاریش ویستی ئاسمان وا دەخوازێ[١٧٤]، چونکە سروشتی هەر جۆرێك مەیلی لەوەیە خۆی بە نەمریی بگەیەنێت، بەوەی تاکەکانی لە شێوەی خۆی بخاتەوە. (بنەمای سروشت، وەك لە شوێنێکی تریشدا وتمان، بریتییە لە خستنەوەی چەند وێنەیەکی هەمان جۆر، وەك چۆن جۆری جیاوازی گیانلەبەر دەخاتەوە)[١٧٥]. سروشت، وەك لە بەشی پێشتردا وتمان، کار دەکات لە پێناو بەردەوامی رەگەزی مرۆیی لە

فۆرمی جۆردا، چونکە ناتوانێت تاکەکان بهێڵێتەوە و بپارێزێت. بەم شێوەیە دەبینین سروشتی هەریەکە لە ژن و پیاو، پێشتر لە لایەن ویستی ئاسمانەوە ڕێکخراوە و گونجێنراوە تا ژیانێکی هاوبەش بژین[176]. لێرەوە مەسەلەی ژیانی هاوبەشی نێر و مێ، مەسەلەیەکی سروشتی دەبێت، کە ئەستەمە بۆ ژن بتوانێت بەبێ یارمەتی پیاو، تاکی هەمان جۆر بخاتەوە. هەر وەك پیاویش ئەستەمە بەبێ یارمەتی ژن بە هەمان ڕۆڵ هەستێ. بەم شێوەیە پێویستیی ژیانی هاوبەش دێتە پێشەوە، کە خوو و نەریت جەختیان لە سەر کردووە و پێویستیان کردووە[177].

خستنەوەی منداڵ تەنیا وەسیلەیەك نییە بۆ خزمەتکردنی سروشت، کە تەنیا دەیەوێت پارێزگاری لە جۆر بکات، بەڵکو وەسیلەیەکیشە بۆ سوودێکی دوو لایەنە. ئەو نارەحەتییانەی کە باوان لە کاتی بەخێوکردنی منداڵە لاوازەکانیاندا توشی دەبن، لەکاتی پیربووندا بە دوو هێندە بۆیان دەگەڕێتەوە، ئەو کاتەی خۆشیان لاوازن و هیچ دەروویەکی تریان نییە.

ئەگەر جیاوازی (هەندێ جاریش دژایەتی) لە نێوان تواناکانی ژن و مێرددا هەبێت، لە سوود و بەرژەوەندی هەردووکیان دەبێت. ئەگەر سروشت لایەکیانی بەهێز و ئەویتریانی لاواز کردووە، بۆ ئەوەیە تا دووەمیان زیاتر وریا بێت و یەکەمیشیان بە تواناتر بێت لە چارەسەرکردنی کێشەکان و ڕەتدانەوەی هێرشەکان بە ئازایەتی خۆی. هەروەها لایەنی بەهێز دەتوانێت بژێوی پەیدا بکات، لە دەرەوە زۆرێك لە شمەك و پێویستییەکانی خێزان دابین بکات و بهێنێتەوە، لە کاتێکدا لایەنی دووەم لە سەریەتی پارێزگارییان لێ بکات، ئەگەرنا پەیداکردنی شمەك و بژێوی مانایەکی نەدەبوو. سروشتە کە ئەم کارە دەکات، لایەکیانی وا لێکردووە بتوانێت ژیانێکی سەقامگیر لە ماڵەوە دروست بکات، دووەمیش بتوانێت چالاکییەکانی خۆی لە دەرەوە ئەنجام بدات، تەنانەت لە منداڵ خستنەوەشدا سروشت هاوبەشی کردوون و هەریەکەیان بە خزمەتێکی تایبەت هەڵدەستن: ژن بە خۆراکدان و پیاویش بە پەروەردەکردن[178].

### ٢- مێرد:

بە رای ئەرەستۆ سروشتییە ئەگەر پیاو فەرمان بدات و ژنیش گوێڕایەڵ بێت (چونکە رەگەزی پیاو لە ژن گونجاوترە بۆ سەرۆکایەتی کردن، پاشان زاڵبوونی پیاو بە سەر ژندا شتێکی زۆر سروشتییە)[١٧٩]. لە راستیدا ئەو هۆکارانەی ئەرەستۆ بۆ پاساودانی ئەو زاڵبوونە دەیانهێنێتەوە، هەندێکیان پەیوەستن بە جیاوازی توانای ئەقڵیی نێوان ژن و پیاوەوە، وەك زاڵبوونی لایەنی ئەقڵی بە سەر لایەنی نائەقڵیدا لە نەفسی پیاودا، لە کاتێکدا لە نەفسی ژندا بە پێچەوانەوەیە و لایەنی نائەقڵی زاڵە بە سەر ئەقڵیدا، ئەمەش لە کۆتایی ئەم بەشەدا و لە کاتی باسی پشتبەستنی ئەرەستۆ بە (سروشتی نەفس) لە رێکخستنی کاروباری نێو کۆمەڵگادا، زیاتر باسی دەکەین. هەندێکی تر پەیوەستن بە بایۆلۆژیاوە، وەك سەلبی بوونی ژن، گوایە هەیولاییە و ئیجابی بوونی پیاو گوایە فۆرمە، وەك لە بەشی پێشوودا باسمانکرد. هەروەها مەسەلەی جیاوازی لە تەمەندا، چونکە ئەرەستۆ لە نەریتی وڵاتەکەی لاینەدەدا، کە تیایدا کچ بە پیاوێك بە شوو دەدرا کە دوو هێندەی خۆی تەمەنی هەبوو، نە لە تەمەندا و نە لە پێگەیشتویی ئەقڵیشدا هاوشانی یەکتر نەبوون. کەچی ئەرەستۆ پاساوێکی فەلسەفی بۆ ئەم دۆخە سەیرە پێشکەش دەکات و پێی وایە، ئەمە کار یان ویستی سروشتە. با تاوێك لە سەر ئەم لێکدانەوەیەی بوەستین.

### ٣- تەمەنی هاوسەرگیریی:

ئەگەر تاوێك لە سەر رای ئەرەستۆ دەربارەی تەمەنی گونجاو بۆ هاوسەرگیریی و ئامانج لێی رابمێنین، دەتوانین تیشکی زۆر بخەینە سەر تیۆرەکەی لە سەر پەیوەندی هاوسەرێتی و ئەو پەیوەندییەش سروشتی دەردەکەوێت[١٨٠].

ئەرەستۆ پێی وایە پێویستە یاسادانەر بایەخێکی زۆر بە بابەتی هاوسەرگیریی بدات، پێویستە تەمەنی هاوسەرگیری و ئەو سیفەتانەی پێویستە لە کوڕ و کچەکەدا، پێش هاوسەرگیریی هەبن دیاری بکات، چونکە ئێمە نەوەیەکی تەواو تەندروستمان

دەوێت، هاوسەرگیرییش ئەو دامەزراوەیەیە کە جەستەی تەندروستمان پێدەبەخشێت، ئەو وەك دایەنگەیەك وایە بۆ دەوڵەتەکەمان[181] تەمەنی هاوسەرگیریی شتێك نییە بکەوێتە دەست ئارەزوو یان میزاجی خەڵکی، بەڵکو پێویستە مەسەلەیەکی زەروری بێت، کە سروشت دەیسەپێنێت، کە ئەویش هیچ کاری بێهودە ناکات و لە هەموو کارێکدا وەك وەستایەکی دەسترەنگین دەردەکەوێت. سروشت خۆی تەمەنی هاوسەرگیریی بەم شێوەیە دیاری دەکات: ئەگەر سروشت تەمەنی حەفتا ساڵی وەك دوا وێستگە بۆ توانای منداڵ خستنەوەی پیاو دانابێت و دوای ئەوە نەزۆك بێت، بۆ ژنیش پەنجا ساڵی دیاری کردبێت، ئێمەش دەبێت بگەڕێینەوە سەر ئەم بنەمایە و لە دیاریکردنی باشترین تەمەنی هاوسەرگیریدا پارێزگاری لە هەمان ڕێژە بکەین. واتە دەبێت جیاوازی نێوان تەمەنی پیاو و ژن لە کاتی هاوسەرگیریدا بیست ساڵ بێت، هەر وەك سروشت خۆی دیاریکردووە!

هەروەها دەڵێت نابێت منداڵان زوو هاوسەرگیریی بکەن، چونکە وەچەیەکی ناکامڵ دەخەنەوە، مێینەی زۆر تیا دەبێت و وەچەشیان لاواز و جەستەی بچووك دەبێت. دەڵێت پێویستە پەند لەوانەی دەوروبەرمان وەربگرین، هەموو ئەو گەلانەی ڕاهاتبوون کە منداڵەکانیان زوو هاوسەرگیری بکەن، وەچەیەکی ناکامڵ و لاواز و بچووکیان خستوەتەوە، تەنانەت دایکانیشیان لە کاتی منالبوونیاندا دەمردن، چونکە (ئەو دایکانە) منداڵ بوون. لێرەوە کاتێك خەڵکی کریت لە سەر ئەو ژمارە زۆرەی مردن لە نێو ژنانی لاودا پرسیاریان لە خواوەند کرد، خواوەند پێی گوتن: (میوەکان پێش پێگەیشتنیان، لێمەکەنەوە). مەبەستی لەوە بوو (پێش کاتی خۆی)، واتە لە تەمەنێکی زوودا کچانتان بە شوو مەدەن. بێگومان ئەو وتەیەی خواوەند، پەیوەندی بە دروێنەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانەوە نییە، بەڵکو ئاماژە بەو ژمارە زۆرەی مردن دەکات کە بە هۆی بە شوودانی کچان لە تەمەنی منداڵیدا (پێش تەمەنی گونجاو) دەکەونەوە[182].

هەروەها هاوسەرگیریی زوو تەنیا زیان بە وەچە ناگەیەنێت، بەڵکو ئازاری لایەنەکانیش دەدات. ئەگەر ئاسایی بێت بڵێین: تەمەنی گونجاوی هاوسەرگیریی کاتێکە لایەنەکان لەوپەڕی توانای منداڵ خستنەوەیاندا بن، ئەو کات ئەو کچانەی زوو دەست بە کاری سێکسی دەکەن خووی پێوە دەگرن، بەڵام کوڕان زیان بە سپێرمەکان دەگەیەنن پێش ئەوەی گەشەیان کامڵ بێت[١٨٣].

تەمەنی گونجاو بۆ هاوسەرگیریی بە رای ئەرەستۆ، بۆ ژن هەژدە ساڵی و بۆ پیاویش سی و حەوت ساڵییە، چونکە جەستەی هەردووکیان لەم تەمەنەدا گەشەیان کامڵ دەبێت، هەروەها توانای خستنەوەی منداڵی یەکەم و بەخێوکردنیشیان دەبێت[١٨٤].

بەم شێوەیە دەبینین ئەرەستۆ، تیۆریزەی دۆخی سەیری ئەو کاتەی کۆمەڵگای یۆنانی دەکات، هەوڵ دەدات پاساوی بۆ دابتاشێ تا لە بەرامبەر ئەقڵدا پشتیوانی بکات. ئەو وای پێ باشە کچ شوو بە پیاوێك بکات، کە دوو هێندەی خۆی تەمەنی هەبێت، ئەم تەمەنی هەژدە ساڵ بێت و ئەویش سی و حەوت، تا هیچ جۆرە نزیکایەتییەك لە نێوانیاندا نەبێت. لێرەوە پیاو، مادام ژنەکەی منداڵە و خۆیشی پێگەیشتویی و ئەزموونی زیاترە، دەتوانێت وەك ناکامێك مامەڵەی (ژنەکە) بکات کە هیچ پێنەگەیشتووە، ئەو دەتوانێت فەرمان بدات و ژنیش دەبێت گوێڕایەڵ بێت. کاتێکیش ئەرەستۆ پرسیار لە خۆی دەکات: (گونجاوترین وەرز بۆ هاوسەرگیریی کامەیە؟ دەڵێ پێویستە کار بەو پەیڕەوە سەرکەوتووە بکەین کە زۆرینەی خەڵکی لە سەری دەڕۆن، کاتێك وەرزی زستانیان[١٨٥] وەك کاتێکی گونجاو بۆ هاوسەرگیریی و پێکهێنانی خێزانێکی نوێ دەستنیشانکردووە)[١٨٦]. سەرەڕای ئەمەش پێویستە گوێ لە ئامۆژگاری پزیشکان و فەیلەسوفانی سروشتی دەربارەی منداڵ خستنەوە بگرن، چونکە پزیشکەکان دەتوانن هەموو شتێکیان لە سەر جەستەیان پێ بڵێن، هەروەها فەیلەسوفانی سروشتیش دەتوانن (با)ی گونجاو دەستنیشان بکەن. ئەوان بۆ نموونە بای باکووریان لە بای باشوور پێ باشترە[١٨٧].

دواتر ئەرەستۆ چەند ئامۆژگارییەکی ژنانی سکپڕ دەکات، پێویستە بۆ نموونە، بایەخ بە جەستەیان بدەن و تەسلیمی خاوبوونەوە و تەمبەڵیی نەبن، تەنیا خۆراکی سووك بخۆن. ئەمەش کارێکی ئاسانە بۆ یاسادانەر ئەگەر بیەوێت بە سەریاندا بیسەپێنێت، کە هەموو ڕۆژێك بە مەبەستی خواپەرستی ڕێکردنێکی نەرم بکەن و سەردانی پەرستگاکانی خواوەند ئارتیمیس بکەن، کە کاروباری منالبوونی بە دەستە. بەڵام ئەقڵیان بە پێچەوانەی جەستەیانەوە، دەبێت لە هەموو چالاکییەك ببەخشرێت، چونکە ئاشکرایە کۆرپەلە لە سکی دایکدا، دەکەوێتە ژێر کاریگەریی دایکەوە، وەك چۆن ڕووەك بە خاك کاریگەر دەبێت[188].

ئەرەستۆ هەمان ڕای ئەفلاتونی مامۆستای لە سەر منداڵە نەخۆش و شێواوەکان هەیە، پێویستە لەکاتی لەدایکبووندا منداڵەکان جیابکرێنەوە، تا بزانین کامیان پێویستە چاودێری بکرێت و بەخێوبکرێت، بە قانونێکیش هەموو چاودێرییەکی منداڵە شێواوەکان قەدەغە بکرێت، بەڵکو دەبێت لە چۆڵەوانیدا بخرێنە بەردەستی دڕندە کێوییەکان (واتە فڕێ بدرێن)[189]. هەروەها دەبێت قانونێك دابنرێت لە هەموو شارەکاندا ژمارەی منداڵ دیاری بکات و نەهێڵێت زیاتر بن، بۆ ئەوەی منداڵ، بە بیانوی پاراستنی ژمارەی دانیشتوان لە ئاستێکی دیاریکراودا لە چۆڵەوانیدا فڕێ نەدرێن. بۆیە ئەرەستۆ پێشنیار دەکات ژمارەی ئەندامانی خێزان دیاریبکرێت، پاشان هانا بۆ لەباربردن ببەین، پێش ئەوەی کۆرپەلە ژیانی بەبەردا بێت یان هەستی بۆ دروستبێت. ئەگەر دەربارەی لەباربردن بپرسین ئایا کارێکی شیاوە یان هەڵەیە، وەڵامەکە بەندە بەوەوە کە ئایا کۆرپەلە ژیانی هەیە و هەستی بۆ دروستبووە یان نا[190].

باسی ئەو سەرەتایەمان کرد کە کچ و کوڕێك خێزان پێکدەهێنن و ژیانی هاوسەری دەست پێدەکەن، ئەو کات دەمێنێتەوە ئەو ماوەیە دیاری بکەین کە ئەم هاوسەرگیرییە بە خستنەوەی منداڵ خزمەتی دەوڵەت دەکات. ئەمەش چونکە نەوەی بە تەمەنەکان (هەر وەك نەوەی گەنجان) لە ڕووی بیرکردنەوە و جەستەشەوە ناکامڵە،

بۆیه بوونیاتی وەچەی کەسە بە تەمەنەکان لاوازە، پاشان دەکرێت سالانی منداڵ خستنەوە بە پێی ماوەی پێگەیشتویی ئەقڵی دیاری بکرێت[191].

بۆ زیناش دەبێت کارێکی ئابڕوبەرانەی ناخۆش بێت، کاتێك ژن و مێرد (لەو ماوەیەدا کە پێکەوەن) ئەنجامی دەدەن. بەلاّم ئەگەر لەو ماوەیەدا بکرێت، کە منداڵ خستنەوە ڕێگەپێدراوە، پێویستە وەك ئابڕوچوونێك مامەڵە بکرێت، کە شایەنی سزای گونجاوی خۆی بێت[192].

ئەرکی ژن و فەزیلەتەکانی دوادەخەین بۆ بەشی داهاتوو، کاتێك باسی بابەتی (ژن و ئەخلاق) دەکەین. بەلاّم ئێستا بە دوای ئەو بنەڕەتانەدا دەچین کە ئەرەستۆ تیۆرەکەی لە سەر بنیاتناوە، دەربارەی دوورخستنەوەی ژنان لە بواری سیاسەت و کورتکردنەوەی کار و چالاکییان تەنیا لە ماڵەوەدا، یان ئەوەی پێی دەڵێت ملکەچیی سروشتی ژن بۆ پیاو و ئەوەشی وای لێ دەکات بڵێت: (زاڵبوونی پیاو بە سەر ژندا مەسەلەیەکی زۆر سروشتییە[193] ئەی مەبەستی لە وشەی (سروشت) چییە کە بەردەوام بۆ پاساودانی دەسەلاّتی پیاو و ملکەچیی ژن دەگەڕێتەوە سەری؟ لە وەلاّمدا دەڵێت ئەمانە هەموویان پەیوەستن بە سروشتی نەفسی مرۆییەوە.

## پێنجەم

## سروشتی نەفس

ئەرەستۆ رای وایە خوێندنەوەیەکی قوڵی ئەو بیرۆکەیەی پێی وایە: هەندێك لە مرۆڤەکان بە سروشت حاکمن و هەندێکیشیان مەحکوم، راستەوخۆ دەمانباتە سەر توێژینەوە لە سروشتی نەفس. نەفس بە سروشتی خۆی دوو رەگەزە: یەکێکیان حاکم و ئەویتریان مەحکوم، هەریەکەشیان فەزیلەتی تایبەت بە خۆی هەیە، یەکێکیان سەر بە لایەنی ئەقڵیی حاکمە و ئەوەکەشیان سەر بە لایەنی نائەقڵیی مەحکومە. ئاشکرایە ئەوەی بە سەر نەفسی مرۆییدا دەسەلمێت، بە سەر حاڵەتەکانی تریشدا دەسەلمێت (وەك ماڵ و دەوڵەت). لەمانەوە دەشێ بگەینە ئەوەی قانونێکی گشتی هەیە، کە (بە پێی ئەو قانونە) سروشتییە ئەگەر هەندێك بە سروشتی خۆیان حاکم بن و هەندێکیش بە سروشت مەحکوم بن[١٩٤].

لەبەر ئەوەی قانونێك یان بنەمایەکی گشتی هەیە لە چەند ئاستێکی جیاوازدا کار دەکات، چەند بوارێکی جیاوازی کارکردنیشی، بە پێی ئەو ئاستانەی کاریان تێدا دەکات دەبێت: حوکمی پیاوی ئازاد (ئاغا) بۆ کۆیلە جۆرێکی حوکمە، حوکمی نێرینە بۆ مێینە جۆرێکی ترە و حوکمی پیاوی گەورە (پێگەیشتوو) بۆ منداڵ جۆری سێیەمە. راستیش وایە بڵێین هەموو ئەو کەسانە (ئاغا و کۆیلە، نێر و مێ، منداڵ و گەورە) لایەنی جیاوازی نەفسیان هەیە[١٩٥]. بەڵام بە شێوەی جیاواز و بە ئاستی جیاوازیش هەیانە: کۆیلە بە تەواوی بێبەشە لە توانای لە سەرخۆیی و هەڵبژاردن، مێینەش هەر چەندە هەیەتی، بەڵام ئەو فۆرمەی لای ئەو هەر بە ناچالاکی دەمێنێتەوە، منداڵیش هەیەتی، بەڵام لە فۆرمێکی پێنەگەیشتوودا[١٩٦].

بەمەش ئەرەستۆ دەگاتە زەروورەتــی ئــەوەی پیــاو حــوکمی ژن، ئاغــا حــوکمی کۆیلە، باوان حوکمی رۆڵەکانیان و گەورەکانیش حوکمی منداڵان بکەن، بۆچی؟ تەنیا درکاندنی ئەوەی بنەمایەك هەیە وا دەکات هەندێك حاکم بن و هەندێکیش مەحکوم، بۆ خۆی پێمان ناڵێت کێ حوکم دەکات. لە لایەکی تــرەوە ئەرەســتۆ بــەوەوە ســەرقاڵ نەبووە، کە مرۆڤەکان گیانلەبەران حوکم بکەن، چونکە پێــی وابــوو کــە گیانلەبــەران ئەقڵیان نییە، ئەمەش دەیانخاتە پلەیەکی خوارووی مرۆڤــەوە و مــرۆڤ دەتوانێــت بــە سەریاندا زاڵ بێت، بەڵام هەموو مرۆڤەکان لەبــەر ئــەوەی مــرۆڤن، ئــەقڵیان هەیــە و بەشدارن لە بنەمای ئەقڵیدا. (١٢٥٩-ب). کەواتە ئەو بنەمایانە چین کە ئەرەستۆ بە هەند وەریاندەگرێت، لەوەدا کە ژن دەکاتە پاشــکۆ و شــوێنکەوتەی پیــاو، هــەر وەك کۆیلە دەکاتە شوێنکەوتەی ئاغا و منداڵیش بە کەمتر لە گەورەکان دادەنێت؟!

خۆشبەختانە ئەرەستۆ خۆی دەڵێت: (پێکهاتەی نەفسی مرۆڤ رێگەمان بۆ رووناك دەکاتەوە) (١٢٦٠-أ). نەفسیش لە دوو لایــەن پێکــدێت: لایــەنی ئــەقڵی و لایــەنی نائەقڵی. سروشتییە، بەڵکو بە سوودە لایەنی ئەقڵی حوکم بکات و کۆنترۆڵی لایــەنی نائەقڵی لە نەفسدا بکات. (١٢٥٤-ب) (بەراوردی بکە بە ئەخلاق: کتێبــی یەکــەم، بەشی سیانزەیەم). هەروەها دادپەروەرانەشە پیاو حوکمی ژن بکات. راستە توانای لە سەرخۆیی ئەقڵییان هەیە، بەڵام کاریگەر نییە، بۆیە زۆر ئاســانە لایــەنی نائــەقڵییان بەسەردا زاڵ بێت! بە هەمان شێوە دەبێت ئاغا حوکمی کۆیلە بکات، چــونکە کۆیلــە ئیرادەی بیرکردنەوەی لە سەرخۆی نییە، لایەنی ئــەقڵیی نێــو نەفســیان هــەر هێنــدە بەکاریان دێت گوێ بۆ فەرمانی ئاغاکانیــان شــل بکــەن، وەریبگــرن، لێــی بگــەن و گوێڕایەڵی بن و کار بۆ جێبەجێکردنی بکەن. لە راستیدا ئەوەی کۆیلە لــە گیانلەبــەر جیا دەکاتەوە ئەوەیە، ئەوان بە پێچەوانەی گیانلەبەرانەوە، کەمترین ئاســتی توانــای ئەقڵییان هەیە، کە رێگە خۆشکەرە بۆ تێگەیشتن لە بیرکردنەوەی ئاغاکانیــان، لەمــە دەرچێت رێك لە گیانلەبەرە کێوییــەکان دەچــن (١٢٥٤-ب). بــاوان و گــەورەکانیش پێویستە حوکمی منداڵ و ناکامەکان بکــەن، چــونکە هــەر چــەندە منــداڵان توانــا و

ویستی بیرکردنەوەی لە سەرخۆی پەیوەست بە لایەنی ئەقڵی نێو نەفسیان هەیە، بەڵام ئەم ویستە هێشتا پێنەگەیشتووە (١٢٦٠-أ).

بەم جۆرە ئەرەستۆ، بوونیات لە سەر هەردوو لایەنی ئـەقڵی و نائـەقڵی نـەفس، هەوڵی پاساودانی ئەو بیرۆکەیە دەدات کـە دەڵێـت: گرووپێـك بـە سروشـتی خۆیـان حاکمن و هەندێکی تریان بە سروشت مەحکومن، رێك هاوشێوەی ئـەوەی لایـەنێکی نەفس (لایەنی نائەقڵی) ملکەچە بۆ لایەنەکەی تر (لایەنی ئەقڵی).

بەمەش سروشـت، کـە هـیچ کـارێکی نابـەجێ و بێهـودە ناکـات، خـۆی ژنـی ناچارکردووە ملکەچی حوکمی پیاو بێت، چـونکە توانـای ئـەقڵیی کـەمترە، لایـەنی نائەقڵیش وەك هەڵچوون و سۆز و شەهوەت و...هتد. بە سەریدا زاڵە. کەسانێکی زۆر بەم بەڵگە ناڕاستە چەواشە بوون و رایـان وایـە ژن، بـە حـوکمی سروشـت، نـەك بـە حوکمی پەروەردە و کۆمەڵگا و نەریت و ژینگە و...هتد، سـۆزاوییە و زوو کاریگـەر دەبێت[197].

ئەوەی وتمان بیرۆکەیەکی گشتی بوو لە سەر بەڵگەکەی ئەرەستۆ، ئەگەر ویستمان زیاتر و قووڵتر لێی تێبگەین، دەبێت بە وردەکارییەکی زیـاترەوە لـە وەسـفەکانی بـۆ هەردوو لایەنی نەفس و پەیوەندییەکانی نێوانیان تێبگەین.

دەبێت بگەڕێینەوە سەر (ئەخلاقی نیکۆمـاخی)، وەك چـۆن دەگەڕێینـەوە سـەر چەند بەشێکی کتێبی سیاسەت، تا بزانین ئەرەستۆ چـۆن وەسـفی لایەنـەکانی نـەفس (ئەقڵی و نائەقڵی) دەکات: مـۆرکی سـەرەکی ئـەم پەیوەندییـە ئەوەیـە، پەیوەنـدی دەسەڵات و زاڵبوونە، دەبێت لایەنی ئەقڵیی نەفس حوکم بکات و زاڵ بێـت بـە سـەر لایەنەکەی تردا. ئەم دەسەڵاتەش لایەنەکان خۆیان بۆ ئامـادەکردووە و بـە سروشـتی خۆیان تیایاندا چەسپیوە (١٢٥٤-ب). لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەرەسـتۆ هەنـدێ جـار بـە ئاشکرا و هەندێ جاریش بە ناڕاستەوخۆیی ئاماژە بەوە دەدات، کە مەرج نییە لایەنی ئەقڵی هەموو جارێك بتوانێت ئەم دەسەڵاتە پیـادە بکـات. وەك باسـکرا، ئەرەسـتۆ دەڵێت لە حاڵەتی ژن و منداڵ و کۆیلـەدا دەبیـنین، لایـەنی ئـەقڵی حـوکمی لایـەنی

نائەقڵی ناکات، رەنگە پێویست بکات بپرسین: ئایا دەبوو لایەنی نائەقڵی لە حاڵـەتی ژن و منداڵ و کۆیلەدا حوکم بکات؟ تەنانەت پیاوە گەورەکانیش، هەندێ جار دەبینین لایەنی ئەقڵی ناتوانێت زاڵبێت بە سەر لایەنی نائەقڵیـدا و ملکەچـی خـۆی بکـات، ئەگەر وا نەبووایـە بـۆ ئەرەسـتۆ پێویسـتی نـەدەکرد، رێنمـایی دەربـارەی بایـەخی سەروەریی لایـەنی ئـەقڵیی نـەفس و بـە سـەرداری مانـەوەی بـدات، وەك چـۆن لـە کتێبەکانی (ئەخلاقی نیکۆماخی) و (سیاسەت)دا کردوویەتی. کە ئەرەستۆ بـاس لـە لایەنی ئەقڵی و زەروورەتـی کـۆنترۆڵکردنی لایـەنی نائـەقڵی دەکـات، ناشـێ تـەنیا ئاماژەیەك بێت بەوەی، ئەوەی لە لایەنێکی نەفسدا روودەدات خۆبەخۆ ئـەوە دیـاری دەکات کە لە لایەنەکەی تردا روو دەدات. لە راستیدا ئەگەر مەبەستی ئەرەستۆ ئەمە بوو بێت: (کە لایەنی ئەقڵی حوکمی لایەنی نائـەقڵی بکـات) لـەم حاڵەتـەدا دەبـوو ئەوەشی بۆ زیاد بکردایە، کە لایەنی نائەقڵی هەندێ جار بۆی دەلوێت حوکمی لایەنی ئەقڵی بکات. بەڵام وەك ئاشکرایە ئەو ئەم بیرۆکەیـە رەت دەکاتـەوە، کاتێـك دەڵـێ رەنگە هەندێ جار وا دەربکەوێت کە لایەنی نائەقڵی حوکمی لایەنی ئـەقڵی دەکـات، بەڵام لە راستیدا وا نییە (١٢٥٤-ب). هەروەها مەسەلەی حوکم یان دەسـەڵات یـان زاڵبوونی لایەنی ئەقڵی، پەیوەستە بە ئیمتیازێك (یـان شـیاوییەك) کـە ئـەم لایەنـە هەیەتی یان دەبێ هەیبێت، چونکە بە حوکمی سروشتی خۆی شیاوە بۆ حـوکمکردنی لایەنی نائەقڵی، با ئەم کارەش هەمیشە روونەدات (١٢٥٤-ب).

لە راستیدا کاتێـك ئەرەسـتۆ باسـی پەیوەنـدیی لایەنـەکانی نـەفس (ئـەقڵی و نائەقڵی) دەکات بـەوەی پەیوەنـدی نێـوان حـاکم و مەحکومـە، لێـرەدا بـە زمـانی سیاسەت و کەسەکان دەدوێت، (وەك ئەوەی) ئـەمیان حـوکمێکی زۆرداریـی بێـت و ئەویان دەستوری یان پادشایەتی (١٢٥٤-ب). کاتێك تەماشای ریزبەنـدیی گونجـاوی بەشەکانی نەفس دەکەین، دەبینین لایەنی ئەقڵی فەرمان دەکات و دەخورێـت، کەچـی لایەنی نائەقڵی گوێگر و گوێڕایەڵە، بە هەمان ئەو شێوەیەی کـە منـداڵ گوێڕایـەڵی باوکی دەکات (ئـەخلاق-١١٠٢ ب) (١١٢٠٣-أ). راسـتییەکەی کاتێـك ئەرەسـتۆ

باسی بەشەکانی نەفس لە هەردوو کتێبی (ئـەخلاق) و (سیاسـەت) دا دەکـات، وەك پەیوەندی نێوان بوونەوەری سیاسی باسی دەکات، نـەك وەك پەیوەنـدی نێـوان چـەند بەشێکی نائەندامی و ناشەخسی.

ئەمـەش ئلیـزابێس سـپێلمان نـاوی دەنێـت (بـە سیاسـیکردنی نـەفس لای ئەرەستۆ)[198]. ئەو بە زمانێك باسی ئەو بەشانە ناکات، کـە بشـێت تـەنیا بـە سـەر پەیوەندی نێوان کەسەکاندا بچەسپێت، بەڵکو هەندێ جار ئەم بەشانە بـە کەسـانێکی دیاریکراو دەچوێنێت:

(وەك چۆن منداڵ دەبێ بە پێی چەند رێنماییـەکی تەمبێکەرانـە بـژێت، ئـاواش لایەنی شەهوانی نەفس دەبێت بە پێی ئاڕاستەکاریی بنەمای ئەقڵی بێت)[199].

(ڕوونکردنەوەی سروشتی شەهوەت بەوە دەبێت، کە شاعیران دەربارەی ئەفرۆدیت Aphrodite، کچە فێلزانەکەی کیپرۆس[200] وتوویانە. بـە پێـی ئاسـتی پەیوەسـتی لایەنی ئەقڵی نەفس بە لایەنی نائەقڵی، دەتوانین لە پەیوەندی نێوان ئاغـا و کۆیلـە و ژن و مێردیش تێبگەین)[201].

ئەرەستۆ زۆرتر دەڕوات و دەگاتـە ئاسـتی یەکخسـتنی (کـەس) و ئـەو بەشـەی نەفس. دەڵێت: ئەو کارانەی خەڵکی لە سەر بنەمایەکی ئەقڵی دەیکەن، پێیـان وایـە باشترە کاری ئەوان بێت، واتە بە ویستی خۆیان بیکەن و هەریەکەشیان یەکسان بێـت بەم یان بەو کار[202]. سەرەڕای ئەمەش ئەرەستۆ هەندێ جار وەك کەسێکی تـر باسـی ئەقڵ دەکات، کە هەر کەس هەیبێت دەبێت شوێنی بکەوێت، دەڵێت: (ئەقڵ لای هەر کەس بێ، هەمیشە باشترین بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت، پیاوی چاکیش ئەوەیـە هەمیشـی گوێڕایەڵی ئەقڵی دەبێت)[203].

دەکرێ بە کورتی بڵێین: کاتێك ئەرەستۆ باسی بەشـەکانی نـەفس و پەیوەنـدییان پێکەوە دەکات، زۆرجار باسکردنەکانی بـە کەسـکردن (تشـخیص) یـاخود چـواندنە (تشـبیە)، دەبیـنین زاراوەی سیاسـی بـەکاردەهێنێت، وەك بڵێـی باسـی پەیوەنـدی کەسانێکی نێو دەوڵەت-شار بکات. لەمەشدا ئەو رێنماییەی کە لە کتێبی (نـەفس)

دا بە خوێنەرانی دەدات بیری دەچێت یان خۆی لێ گێل دەکات، بەوەی بەشەکانی نەفس و وەزیفەکانیان بە کەس نەکەن[٢٠٤]. ئیلیزابێس سپێلمان وەسفی ئەرەستۆ بۆ سروشتی نەفس و بەکارهێنانی ئەم وەسفە بۆ پاساودانی تێڕوانینەکەی بۆ ژن، بەوەی بە سروشتی خۆیان ملکەچی پیاوانن[٢٠٥] بەم شێوەیە باس دەکات:

١- لە نەفسدا لایەنێکی بە سروشت ئەقڵی هەیە کە حوکم و کۆنترۆڵی لایەنی نائەقڵی دەکات (هەر چەندە هەمیشە ئەم کارەشی بۆ نەچێتە سەر). ئەگەر لە سروشتی کۆنترۆڵی لایەنی ئەقڵی بۆ لایەنی نائەقڵی نەفس تێبگەین، دەتوانین لە سروشتی حوکمی پیاوان بە سەر ژنان لە نێو شاردا تێبگەین. ئاوەهاش ئەرەستۆ دەگاتە ئەنجامی دووەم:

٢- لە دەوڵەتدا پێویستە پیاوان بە سروشتی خۆیان حوکمی ژنان بکەن و زاڵبن بە سەریاندا. سروشتی پیاو و ژن وایە، یەکەم حاکم بێ و دووەمیش مەحکوم. بەڵام بۆچی (و چۆن) ئەرەستۆ پیاوان و لایەنی ئەقڵیی نەفس پێکەوە دەبەستێتەوە، کەچی ژن دەبەستێتەوە بە لایەنی نائەقڵی نەفسەوە؟ چونکە پێی وابوو:

٣- لایەنی ئەقڵی لە نەفسی پیاواندا بە سروشتی خۆی حوکمی لایەنی نائەقڵی دەکات و بە سەریدا زاڵە. لە کاتێکدا:

٤- لایەنی ئەقڵی لە نەفسی ژندا بە سروشتی خۆی حوکمی لایەنی نائەقڵی ناکات و بە سەریدا زاڵ نییە. یاخود:

٥- لایەنی نائەقڵی لە نەفسی ژندا (بە سروشتی خۆی) حوکمی لایەنی ئەقڵی دەکات و زاڵە بە سەریدا. بێگومان ئەرەستۆ پێی وایە توانای لە سەرخۆیی (پەلە نەکردن) لە ژندا، دەسەڵاتی نییە و ویستی ژنیش کاریگەر نییە. ئاوەهاش لایەنی نائەقڵی حوکمی لایەنی ئەقڵی دەکات و زاڵ دەبێت بە سەریدا. بە کورتی ئەگەر لە پیاوی ئازاددا لایەنی ئەقڵی حاکم بێت، لە ژندا وا نییە و دەسەڵاتی نییە. ئەمەش مانای شتێکی گرنگە، ئەوەی ژنان کە ملکەچ یان شوێنکەوتەی پیاوانن، بە حوکمی نەریت یان کولتوور و...هتد نییە، بەڵکو هەر بە سروشت وا خەڵق بوون، ڕێک وەك

ئەوەی ئەوانەی حاکمن بە سروشت وەهان، ئەوانەشی مەحکومن، بە سروشت وەهـان. سروشت ناتوانێت ژن ملکەچی پیـاو بکـات، ئەگـەر پێشـتر لایـەنی ئـەقڵییانی بـێ دەسەڵات نەکردبێت. بەم شـێوەیە ئەرەسـتۆ پێـی وایـە ژن، بـە حـوکمی سروشـت، ملکەچی پیاوە و هەر ئەویش (واتە سروشت) کـار بـۆ بەدەسـتهێنانی ئـەم ئامانجـە دەکات. واتە کەمی دەسەڵاتی لایەنی ئەقڵی لای ژن کـار و کـردەوەی سروشـتە. بـە کورتی ژنان بە سروشتی خۆیان (نا سروشتین)[٢٠٦].

لەبـەر رۆشـنایی ئـەوەی رابـورد بۆمـان دەردەکـەوێت، کـە ئەرەسـتۆ، تـەنیا شیکەرەوەی دۆخی باو (ئەو کاتـەی کۆمـەڵگای یۆنـان) نـەبووە، بـەڵکو تیـۆریزەی دۆخەکەشی کردووە.

دەبێ بزانین کە لایەنی ئەقڵیی ژن هەمیشـە بـێ دەسـەڵات نییـە لـە بەرامبـەر لایەنی نائەقڵیدا و هەر واش بەردەوام نابێت، چونکە ئەگەر وابـێ نـاتوانین جیـاوازی بکەین لە نێوان حاڵەت (یان دۆخ) ی سروشتیی ژن لەگەڵ حاڵەتی ناسروشتیی پیـاوی ئازاددا، ئەو کاتەی ملکەچی شەهوەت و رەمەکەکانی دەبێت و لە چێژپەرستیدا نوقم دەبێت. لە حاڵەتی ئەم پیاوەشدا لایەنی ئەقڵی، وەزیفـەی سروشـتیی خـۆی بـە جـێ ناگەیەنێت، کە خۆی لە کۆنترۆڵکردنی لایەنی نائەقڵیدا دەبینێتەوە. لە حاڵـەتی وادا لایەنی ئەقڵی دەسەڵات و وەزیفەی سروشتیی خۆی نابێت، هـەر چـەندە توانـای ئـەو کارەشی هەبێت، چونکە پێشتر سروشت بـۆ جڵـەوگرتنی لایـەنی نائـەقڵی ئامـادەی کردووە.

کەچی لە حاڵەتی ژندا، دەبینین لایـەنی ئـەقڵی دەسـەڵاتی نییـە، هـەر چـەندە سروشت پێشتر ئامادە باشیی بۆ کردووە، چونکە کەسەکە لێرەدا ژنە. ئەرەستۆ لێرەدا دەکەوێتە هەڵەیەکی کوشـندەوە. لـە لایەکـەوە دەڵێـت: سروشـت لایـەنی ئـەقڵی وا خولقاندووە کە زاڵبێ بە سەر لایەنی نائەقڵیدا، کەچی وەختێك باسی ژن دەکات لـەم بنەمایەی کە خۆی دایناوە، لا دەدات و دەڵێت: سروشت پیاوی هەڵبژاردووە حـوکمی

ژن بکات، وەك بیەوێت بڵێت سروشت لـە ژنـدا بـە جۆرێـك لایـەنی ئـەقڵی نەفسـی والێکردووە، هیچ دەسەڵات و هەژموونی بە سەر لایەنی نائەقڵیدا نەبێت.

ئایا ئەمە مانای وایە کە ئەرەستۆ بۆ گەیشتن بەو بیرۆکەیەی کە دەڵێـت: ژن بـە سروشتی خۆی دەبێت ملکەچی پیاو بێت، دەبوو پێشەکییەکی سەرەکی خۆی نکـوڵی لێ بکات، ئەوەی کە لایەنی ئەقڵی نەفس بە سروشتی خۆی حوکمی لایەنی نائـەقڵی دەکات؟

با جارێکی تریش بە بەڵگەکەیدا بچینەوە:

ئەو دەڵێت: مـادام لایـەنی ئـەقڵی حـوکمی لایـەنی نائـەقڵی دەکـات، ئـاواش پێویستە پیاو حـوکمی ژن بکـات. ئەمـەش واتـە ئەقڵانیـەت لـە پیاوانـدا کـورت دەکاتەوە، کەچی نائەقڵانییەت دەلکێنێت بە ژنانەوە، بەڵام لە سەر چ بنەما گـەلێك ئەم کارەی دەکـات؟ لـە سـەر ئـەوەی، وەك پێشـتریش باسمـانکرد، گوایـە سروشـت ئەقڵانیەتی لە پیاودا زاڵکردووە، کەچی لە ژندا بێ دەسەڵاتی کردووە، بانێکـە و دوو هەوا.

باشە ئەرەستۆ چۆن زانی کە سروشت دەیەوێت ئەو کارە بکات؟ مەبەستم لەوەیە: چۆن زانی سروشت پیاو و ژن وەها لێ دەکات؟ تـەنیا وەڵامـی شـیاوی ئەوەیـە، کـە پیاوان ئەقڵانین و ژنان وا نین. بەڵام ئەمە نابێتە بەڵگە لە سەر ئـەوەی سروشـت ئـەو کارە دەکات، ئەرەستۆ بۆ خۆی دەڵێ: تەنیا سەرکەوتن و زاڵبوونی لایەکی نـەفس بـە سەر لایەکەی تردا (هەروەها زاڵبوونی گرووپێکی خەڵك بـە سـەر گرووپێکـی تـردا) نابێتە بەڵگە لە سەر ئەوەی، کە دەبێت شتەکان وەها بن تـا لەگـەڵ سروشـتدا وێـك بێنەوە. کەواتـە بەڵگەکارییەکـەی ئەرەسـتۆ لـە سـەر ملکەچـبوونی ژن بـۆ پیـاو، بەڵگەکارییەکی لاواز و فشۆڵە، چونکە رایەکی دژیـەکی هەیـە لـە سـەر پەیوەنـدی سروشتیی نێوان لایەنی ئەقڵی و لایەنی نائەقڵی نـەفس. پاشـان پێچـەوانەی قسـەی خۆی دەکات و دەڵێ، ئەقڵ بە سروشت لە پیاودا حاکمە و لە ژندا بێ دەسەڵاتە[٢٠٧].

# بەشی سێیەم

# ژن و ئەخلاق

((خراپترین سیفەتەکانی پیاو، باشترین سیفەتەکانی ژنن، کە ئەوانیش: ترسنۆکی، خۆ بە زل زانین و رژدین)).

ئیمامی غەزالی: زیندووکردنەوەی زانستە ئاینییەکان ب٢ ل ٤٤.

((بۆ ژن گونجاو نییە، کە فەزیلەتەکانی پیاوی هەبێت)).

ئەرەستۆ: هونەری شیعر ١٤٥٤-أ.

((ئەوەی پیاو دەیکات، زۆر مەردانەترە لەوەی ژن دەیکات)).

ئەرەستۆ: وتاربێژی ١٣٦٧-أ

## یەکەم

# هیرارکییەتی ئەخلاق

ئەمە سێیەم بوارە کە ئەرەستۆ بیرۆکە میتافیزیکییەکانی تێدا تاقی دەکاتەوە (یان بە سەریدا پراکتیکی دەکات)، ئەو بیرۆکانەی تیۆرەیەکی تەواو لە سەر ژن دروست دەکەن، ئەوەتا لێرەشدا جارێکی تر بیرۆکەی هەیولا و فۆرم و هیرارکییەت و وەزیفە و...هتد دەبینین. پێشتر زانیمان ئەرەستۆ، بە ئاڕاستەی (با)ی کۆمەڵگای یۆنانی شەنی کردووە و پێی وایە، پێناسە و ناسینی ژن بە منداڵ خستنەوە و بەخێوکردنیان دەبێت، بە وردتر بڵێین: بەخێوکردنی کوڕەکان، چونکە باوك گرنگی بە بەخێوکردنی کچەکان نەدەدا. بە کورتی (دۆخی ژن لە کۆمەڵگای یۆنانیدا زۆر لە دۆخی کۆیلە دەچوو، چونکە وشەی ژن لە Damar ەوە هاتووە، ڕەگی ئەم وشەیەش مانای شوێنکەوتەیی دەدات. کاتێك بووك دەگەیشتە ماڵی زاوا، سەبەتەیەك فستقیان بە سەردا دەڕژان بۆ هێنانی بەخت، ئەم نەریتە بۆ ئەو کۆیلانەش دەکرا کە تازە پیاوەکە کڕیبوونی. ژنیش هەر وەك کۆیلە، بە هیچ جۆرێك قانون نەیدەپاراست ئەگەر مێردی نەکردایە، ڕاستییەکەی لە قانوندا وەکو -کەس- ێك تەماشا نەدەکرا[٢٠٨].

ئاوەها ڕۆڵی ژن لە منداڵ خستنەوە (کە هیچ چێژێکی سێکسی نییە، مەسەلەی چێژ کاری لەشفرۆشان و لوسکەکان بوو) و چاودێری و بەخێوکردنی منداڵەکان، بە تایبەتیش کوڕەکان کورتکرایەوە. سەرپەرشتیکردنی کاری نێو ماڵ و بەجێهێنانی ئەرکەکانی بەرامبەر بە مێرد، پاشان لە بەرامبەر منداڵ و کۆیلەکانیشدا، ئەمەیان پاش کەمێك باس دەکەین. هیچ ڕۆڵێکی لە دەرەوەی ماڵ و منداڵ خستنەوەوە نەبوو، بۆ ئەوەی پارێزگاریی لە وەچە و بەدەستهێنانی نەمریی بۆ پیاو بکات، چونکە ئەو

وەسیلەیەکە پیاو بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی، لە ژیان و لە پاش مردنیش بەکاریدەهێنێت.

ئەگەر کەمێك لە تیۆری ئەرەستۆیی رامێنین دەبینین، ئەو خوو و نەریتانەی بە کردەوە لە کۆمەڵگادا هەبوون (تیۆریزە) دەکات، بیرە میتافیزیکییە بنەڕەتییەکانی ئەرەستۆ یارمەتی دەرن لە پێدانی پاساوی ئەقڵی بە دۆخی خراپی ژنی کۆمەڵگای ئەسینایی: ژن بە پێی هیرارکییەت لە پیاو نزمترە و توانای ئەقڵیی کەمترە، چونکە لایەنی جەستە یان هەڵچوون و شەهوەت و...هتد زاڵە بە سەریدا، هەر وەك پێش تاوێك وتمان، لە کۆیلەوە نزیکترە. لە تواناشدا بە گشتی لە پیاو لاوازترە، چونکە بە پێی بایۆلۆژیا گەرمیی کەمترە لە پیاو، ئەو هەیولایە و پیاو فۆرمە، ئەو جەستەیە و پیاو رۆحە، ئەو مادەی خاوە و پیاویش بنەمای ئەقڵییە. بۆیە پیاو بەرز و بالاّ و جوانترە، سەرەتا لە ماڵدا حوکم دەکات و دەبێت ژنیش گوێڕایەڵی بێت، پاشان هەر خۆی لە دەوڵەتدا حوکم دەکات و ژنیش پێویستە لە ژاوە ژاوی سیاسەت بە دوور بێت و بێدەنگی هەڵبژێرێت، چونکە بێدەنگی (تاج و زینەتە) بۆی.

ئەگەر پرسیار لە دۆخی ژن لە بواری ئەخلاقدا بکەین، واتە پەیوەندی بە فەزیلەتە مرۆییەکانەوە، وەلاّمی ئەمەش هەروەك ئەوانی پێشوو دەبێت، (تیۆری ئەخلاقی ئەرەستۆ بە تەواوی و بە شێوەیەکی ئاشکرا کاریگەرە بە تیۆرە هیرارکییەکەی کە زۆر بە سروشتی دەزانێت، چونکە زەرورییە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە تایبەتەکان بە ژیانی مرۆڤەوە)[٢٠٩].

دەکرێت بە شێوەیەکی گشتی بڵێین:

١- هەموو فەزیلەتە مرۆییە بنەڕەتییەکان، کە ئەرەستۆ لە کتێبی (ئەخلاق) دا باسیان دەکات، وەك هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و دادپەروەری و...هتد بۆ هەموو کەسەکان بە هەمان ئاست نین، بەڵکو لە سروشتی خۆیاندا جیاوازی ریشەییان تێدایە، بەندن بە دۆخی رێژەیی کەسەکانی نێو کۆمەڵگا و پلە و پێگەی کۆمەڵایەتی و خێزانی هەریەکەیان و...هتد.

٢- ئەرەستۆ بە شێوەیەك سەیری هیچ یەکێك لە چەمکە سەرەکییەکانی ئەخلاق: وەك دەستپاکی و شەرەف و دڵسۆزی و داوێنپاکی و ئازایەتی و...هتد ناکات، کە بەسەر هەموو کەسێکدا وەك یەك راست دەرچن، بەڵکو پێویستە رەچاوی دۆخی کەسەکە لە ریزبەندی هیرارکییەتی مرۆیی و پلە و پێگە و وەزیفەی بکرێت. ئەم شتانەن کە جۆری فەزیلەت، یان ئازایەتی و داوێنپاکی پێویست بۆ ئەو کەسە یان یەکێکی تر دیاری دەکەن. پێم بڵێ لە چ دۆخێکی کۆمەڵایەتی دایت: پێت دەڵێم ئەو فەزیلەتانەی کە دەبێت هەتبن چین.

بۆیە ئەرەستۆ هەر لە سەرەتاوە، چەند پرسیارێك دەوروژێنێ لە سەر ئەو فەزیلەتانەی کە دەبێت ئەندامانی خێزان هەیانبێ، هەروەها لە سەر ئەوەشی کە ئایا لای هەموو کەسێك وەك یەکن یان نا. بە کۆیلە دەست پێدەکات و پێی وایە، شتێکی سەلماوە کە ئەوان نرخێکی دیاریکراویان هەیە، چونکە ئامێری زیندوون و خزمەتکارن (لێرەدا دیقەتی ئەوە بدە کە ئەمان هەمان کاری ئەو (گا)یە دەکەن کە هزیۆدی شاعیر لە شیعرەکەیدا باسیکرد) بەڵام ئایا دەشێ فەزیلەتی تریان هەبێت؟ فەزیلەتی باڵاتر هەن؟ دەشێ رێزی خۆ و ئازایەتی و دادپەروەری و فەزیلەتی تریان هەبێت؟ پاشان دەڵێت:

دەتوانین بە دوو شێوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، هەریەکەشیان بۆ خۆی کێشەیەکە: ئەگەر بڵێین بەڵێ فەزیلەتی هاوشێوەی ئەمانەیان هەیە، پرسیارێکی تر قوت دەبێتەوە: لەم حاڵەتەدا جیاوازی ئەمان و مرۆڤە ئازادەکان لە چیدایە؟ ئەگەر بشڵێین نەخێر فەزیلەتی وەهایان نییە، ئەمەشیان هەر سەیرە، چونکە ئەوانیش مرۆڤن و توانای ئەقڵییان هەیە[٢١٠].

دەشێ ئەو پرسیارە بۆ ژن و منداڵیش بکەین: ئایا هیچ فەزیلەتی تریان هەیە؟ ژن دەتوانێت رێزی خۆ و ئازایەتی و دادپەروەری هەبێت؟

دەشێ ژن خێرخواز و بەخشندە و چاکەکار بێت، واتە فەزیلەتی داوێنپاکی و جڵەوگرتنی نەفس و فەزیلەتەکانی تری پیاوی هەبێت، یان فەزیلەتی تایبەت بە خۆی هەیە؟ ئایا دەتوانین بە منداڵ بڵێین داوێنپاك یان داوێنپیس؟[٢١١]

ئەرەستۆ بەردەوام دەبێت و دەڵێت: پێش وەڵامدانەوە پێویستە پرسیارەکە لەوە دوورتر ببەین، دەبێت پرسیار بە شێوەی گشتی بکەین نەك لە سەر حاڵەتی ورد و تایبەت، ئایا فەزیلەتی ئەوانەی بە سروشت حاکمن هەمان فەزیلەتی ئەوانەیە کە بە سروشت مەحکومن؟ ئەگەر بڵێین هەمانن، ئیتر بۆچی هەندێکیان هەمیشە حاکم و هەندێکیان هەمیشە مەحکومن؟ نابێت جیاوازی نێوانیان لە پلە (درجە) دا بێت، چونکە ئەگەر وابێت دەشێ هەمان فەزیلەتیان هەبێت، بەڵام بە رێژەی جیاواز. بەڵکو دەبێت جیاوازییان لە جۆر (نوع) دا بێت. پلە یان چەندێتی پەیوەندی بەم بابەتەوە نییە. لە لایەکی ترەوە ئەگەر بڵێین: یەکێکیان دەبێت فەزیلەتی هەبێت و بەشدار بێت تیایدا و ئەویتریان نەیبێت، خۆمان دەخەینە دۆخێکی نالەبارەوە، چونکە چۆن سەرۆك لە هونەری حوکمدا شارەزا دەبێت ئەگەر داوێنپاك نەبێت؟ چۆن حاکم دەتوانێت سەرکەوتوو بێت ئەگەر دادپەروەر نەبێت؟ ئەگەر مەحکومەکانیش فەزیلەتی داوێنپاکی و دادپەروەرییان نەبێت، چۆن دەتوانن بە باشی گوێڕایەڵ و ملکەچ بن؟[٢١٢]. ئەگەر پێیان بڵێین کۆمەڵێك ترسنۆك و خوێڕی، ئەو کات ناتوانن ئەرکی خۆیان بە جێ بگەیەنن. لێرەوە ئەو ئەنجامەی ئەرەستۆ پێی دەگات ئەوەیە، کە هەردوو لایەن، حاکم و مەحکوم، دەبێت لە فەزیلەتدا بەشدار بن، با جۆری فەزیلەتیشیان جیاواز بێت، حاکمان فەزیلەتی خۆیان هەبێت، مەحکومەکانیش فەزیلەتی تایبەت بە خۆیانیان هەبێت.

هەمان بنەما بۆ ژن و کۆیلەش دەخوات، یەك پێوەری ئەخلاقیمان نییە، کە بە سەر هەمووواندا وەك یەك بچەسپێت، یەك فەزیلەتی ئەخلاقیش نییە بۆ مرۆڤ وەك ئەوەی مرۆڤە، واتە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بەڵکو هیرارکییەتی ئەخلاق و پلەبەندیی فەزیلەتەکان هەن، کە زۆر پەیوەستن بە دۆخی هەر تاکێك و پێگەی لە کۆمەڵگادا.

## دووەم
## ئەخلاقی خێزانی

ئەرەستۆ رای وایە هەموو ئەندامانی خێزان بەشدارن لە فەزیلەتدا، بەڵام بە رێژە و شێوەی جیاواز بەشدار دەبن تێیدا، هەریەکە و بە پێی پێگە و وەزیفەیان لە خێزاندا. سەرۆکی خێزان هاوشێوەی سەرۆك یان حاکم دەبێت تا دەتوانێت بالاترین و کاملترین فەزیلەتەکانی هەبێت، چونکە کاری ئەو کاری ئەندازیارە، یان ئەقڵی ئەندازیار. ئەندامانی تری خێزان هێندە بەسە هەر یەکە و بە پێی پێویستی پێگەکەی خۆی فەزیلەتی هەبێت: داوێنپاکی ژن هەمان داوێنپاکی مێرد نییە، ئازایەتی ژنیش هەمان ئازایەتی پیاو نییە. هەروەها لە دادپەروەریشدا جیاوازن: ئازایەتی سەرۆك یان حاکم و ئازایەتی ژن و ئازایەتی کۆیلەمان هەیە و...هتد. ئەگەر پیاو بە قەد ژن ئازا بوو، دەبێت بە ترسنۆك ناوبنرێت. هەروەها ژنیش دەبێتە چەنەباز ئەگەر سنوری خۆی بە سنوری پیاو دیاری بکات، کە دەزانێت چۆن لە ژیاندا رەفتار دەکات. ئاوەهاش وەزیفەی پیاو لە خێزاندا زۆر جیاوازە و فەزیلەتەکانیشی لەوانی ژن جیاواز دەبن.

ئەگەر کۆیلە هەر بە سروشت بە کۆیلەیی لەدایك ببێت، هێزی جەستەیی بۆ ئەنجامدانی کاری قورس پێدرابێت، لە بەرامبەردا توانای ئەقڵی سنوردار کرابێت، تەنیا ئەوەندە نەبێت کە لە فەرمانی ئاغاکەی تێبگات، ئەوا فەزیلەتی جیاوازیشی دەبێ، دەبێ گوێڕایەڵ و ملکەچ بێت و فەرمانی ئاغاکەی تێبگات و جێبەجێی بکات، چونکە ئەم کارەی سوود و بەرژەوەندی خۆی تێدایە. لە راستیدا فەزیلەتەکانی کۆیلە مەبەست لێیان ئاسانکردنی کاری ئاغایە، رێك وەك چۆن فەزیلەتی منداڵ بۆ کار ئاسانیکردنە بۆ گەورەکان، کە شەونخونی دەکەن بۆ بەخێوکردن و پەروەردەکردنی. لەم تیۆرەدا دەبینین بەها رۆحییەکان پشتگوێ خراون، جا لای منداڵ بن یان کۆیلە،

بگرە ئەم تیۆرە بە سەر چینی بەرهەمهێنی نێو کۆمەڵگاشدا جێبەجێ دەبێت، وەك پیشەوەران و جوتیاران و بازرگانان و...هتد.

بۆ بابەتی ئەرکی هەر یەکە لە ژن و مێرد لە پەیوەندی خێزانییاندا، ئەرەستۆ بەم شێوەیە کورتی دەکاتەوە[٢١٣]:

## ١- ئەرکەکانی ژن:

ئەرەستۆ پێی وایە ژنی (باش) کە شایەنی ئیمتیاز و پیاهەڵدان بێت ئەوەیە، کە بە پلەی یەك ژنی ماڵەوە بێ و خەریکی بەخێوکردنی منداڵ بێت و لە سەر چەند رێسایەکی دیاریکراو کار بکات، لەوانە[٢١٤]:

١- نابێت رێگە بە کەس بدات بەبێ پرسی مێردەکەی بێتە ماڵەکەی[٢١٥].

٢- دەبێت لە وتی وتی بە دوور بێت، یان هەر کارێکی تر کە ئەو ژنە وێڵگەردانە دەیکەن کە لەم ماڵ دەگوازنەوە بۆ یەکێکی تر و نەفسەکان ژەهراوی دەکەن[٢١٦].

٣- ئەوەی لە نێو ماڵدا دەگوزەرێت بە کەس نەڵێت، تەنیا خۆی لێی ئاگادار بێت، ئەگەر شتێك لە دەرەوەش روو بدات پیاو بەرپرسیارە[٢١٧].

٤- دەبێت هەڵسوڕاو بێت و خەرجی ماڵ رێك بخات[٢١٨] لەگەڵ ئەو ئاهەنگانەی کە مێردەکەی حەزی لێیەتی، سنورێك بۆ خەرجیی خواردن و پۆشاك و خۆڕازاندنەوە دیاری بکات، لەوە تێبگات کە جوانی بە پۆشاکی گرانبەها و زێڕ و زیوی زۆر نییە[٢١٩].

٥- بەهای ژن بە زێڕ نییە، بەڵکو لە رەفتار و مەیلی لە ژیانێکی شەریفانەی رێکخراودایە، ئەمەیە رێزی ژن زیاد دەکات و لە پیریشدا هەر دەمێنێت، دوای خۆشی بۆ منداڵەکان دەمێنێتەوە.

ئەمەیە مەملەکەتی ژن کە دەبێت بزانێت چۆن رێکی بخات و حوکمی بکات، جوان نییە بۆ پیاو هەموو شتێکی نێو ماڵ بزانێت: بەڵام لە هەموو مەسەلەکانی تردا

پێویستە ئامانجی گوێڕایەڵی و ملکەچی پیاو بێت، بیٚ گوێدانە مەسەلە گشتییەکان. تەنانەت کاتێك منداڵەکان دەگەنە تەمەنی هاوسەرگیریی، نابێت لەم مەسەلەیەدا رای هەبێت، بەڵکو دەبێت بە تەواوای بکشێتەوە و بە هەموو ریزێکەوە گویٚ لە مێردەکەی بگرێت، رازیش بێت بە بڕیاری و گوێڕایەڵی فەرمانی بێت. ئەوە بزانێت کە ئەگەر جوان نییە بۆ پیاو دەست لە کاروباری نێو ماڵ وەربدات، ئەوا بۆ ئەمیش جوان نییە دەست لە کاروباری دەرەوە وەربدات (ژنی خاوەن ژیانێکی رێکخراو دەبێت بە جۆرێك سەیری داواکارییەکانی مێردەکەی بکات، وەك ئەوەی قانونگەلێك بن کە ویستی ئیلاهی سەپاندونی)[220] مادام بەردەوامن پێکەوە. ئەگەر بە نەفەس درێژیی و ئارامگرییەوە بەرگەی ئەم ژیانە بگرێت، ئەو کات بە ئاسانی ماڵ بەڕێوە دەبات، ئەگەرنا ناتوانێت بە ئاسانی ئەو کارە بکات[221].

پاش ئەمە ئەرەستۆ چەند ئامۆژگارییەك پێشکەشی ژنی (باش) و (گونجاو) کە شایەنی وەسف و پیاهەڵدان بێت دەکات، لەوانەش:

لە خۆشی و ناخۆشیشدا بەوەفا بێت بۆ مێردەکەی، نابێت لە کاتی خۆشیدا گوێڕایەڵی بکات و لە کاتی ناخۆشیدا پشتی تێبکات: (ئەگەر بە هۆی نەخۆشی و هەڵەی خۆیەوە سامانەکەی لە دەست بدات، ژنەش دەبێت بیسەلمێنێت کە رەسەنە. هەروەها بە چەند وشەیەکی جوان هانی بدات و بە هەر رێگەیەکی شیاو بیٚ گوێڕایەڵی بێت، هیچ کارێکی نەشیاو و قۆڕ نەکات، باسی کارێکی خراپی نەکات کە لە کاتی ناڕەحەتییەکی دەرونیدا ئەنجامیداوە. دەبێت زۆر بۆڵە و گلەیی نەکات، یان تۆمەتباری بکات بە هەڵەکردن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، دەبێت هەموو شتێك بداتە پاڵ نەخۆشی و لەبیرکردن، یان هەڵەی بچووك، چونکە چەند لەم کاتە ناخۆشانەدا پشتیبگرێت و خۆڕاگر بێت، ئەویش کە چاك بووەوە یان سامانەکەی بۆ گەڕایەوە، چاکەی دەداتەوە)[222].

ئەرەستۆ پێی وایە ئەو ژنەی لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەند یان خاوەن دەسەڵاتدا دەژی، هەلی ئەوەی بۆ نارەخسێت تا حەقیقەتی خۆی نیشان بدات، چونکە ئەوە

توانای بەرگەگرتنی ئـازار و ناخۆشـییە کـە دەبێتـە مایـەی بـەڕێزی و لـەو کاتـەدا حەقیقەتی دەردەکەوێت، چونکە رۆحی گەورە بەرگەی ژیانی نێـو ناخۆشـی و کێشـە دەگرێت بێ ئەوەی هیچ هەڵەیەك بکات: (ئەو هەمیشە نزا دەکـات پیاوەکـە توشـی کێشە نەبێت، کە توشی کێشەش بوو دڵنیایە، کە ژنی باشی شایەنی پیاهەڵـدان لـەم کاتانەدا دەردەکەوێت[٢٢٣] . ئەرەستۆ بۆ ژنـی چـاك و بـە وەفـا چـەند نموونەیـەکی بـە ناوبانگ دەهێنێتەوە. دەڵێت:

( ئەگەر ژن دەیەوێت باش بێت، دەبێت ئەوەی لە بیر بێـت کـە ئەلکسـتیس[٢٢٤] هێندە ناوبانگی نەدەبوو، پینیلۆپیش[٢٢٥] هێندە بە بالاّیـدا هەڵنـەدەدرا، ئەگـەر وەك دەزانین مێردەکانیـان توشـی کارەسـاتێك نەبوونایـە. بـەم شـێوەیە نارەحەتییـەکانی ئەدمیتۆس و ئۆلیس بوونە هۆی دروستکردنی ناوبانگێکی باش بۆ ئەم دوو ژنە، کـە قەت لە بیر ناچنەوە، چونکە لە کاتی بەلاّ و کارەساتدا دڵسۆزی و وەفـای خۆیـان بـۆ مێردەکانیان سەلماند، خواوەندیش بەو هۆیەوە رێزگرتنیانی پێویسـتکرد. هۆیەکەشـی ئەوەیە بۆ پیاو ئاسانە لە کاتی خۆشیدا هاوبەشی خۆی بدۆزێتەوە، بـەلاّم ژنـی بـاش ئەوەیە لە کـاتی کارەسـات و ناخۆشـیدا دەردەکـەوێت، بۆیـە دەبێـت ژن بـە هـۆی مێردەکەیەوە شەرمەزار نەبێت یا سامانیشی نەمێنێت یان نەخۆش بکەوێت[٢٢٦] .

## ٢- ئەرکەکانی مێرد:

ئەگەر ژنی چاك چەند ئـەرکێکی هـەبێت، کـە دەبێـت پێیانـەوە پابەنـد بێـت، مێردیش (ئەگەر دەیەوێت چاك بێت) بە هەمان شێوە دەبێت چەند ئەرکێکی خۆی بە باشی بە جێ بگەیەنێت[٢٢٧] . پێویستە بە هـەمان شـێوە مامەڵـەی ژنەکـەی بکـات، مادام وەك هاوبەشێك هاتووەتە نێو ژیانی خۆی و منداڵەکانییەوە، چونکە منداڵەکان ناوی هەردووکیان پێکەوە هەڵدەگرن. چ لەوە پیرۆزتـرە کـە پیـاو لـە ژنێکـی باشـی خانەدان، منداڵانێك بخاتەوە کە ببنە مایەی سـوکنایی بۆیـان و لـە کـاتی پیربوونـدا یارمەتییان بدەن و چاویان لێیان بێت و پارێزگارییان لێبکەن؟ پەروەردەکردنی منـداڵ

لە لایەن باوانەوە لە کاتی ژیانیاندا دەبێتــە هــۆی گەشــەکردنیان لــە ســەر بنــەمای فەزیلەت. بەبێ ئەم پەروەردەیــەش رەفتاریــان خــراپ دەبێــت، ئەگــەر بــاوان نەبنــە نموونەیەکی جوان بۆ منداڵەکانیان، ئەو کات ناچار نموونەی خراپ وەردەگرن و بیــانوو بۆ رەفتــاری خراپیــان دەدۆزنــەوە، رەنگــە ببنــە هــۆی سەرشــۆڕیی و لــە ناوچــوونی خۆیان[٢٢٨].

هەروەها دەبێت راهێنانی ژن لــە لایــەن مێــردەوە گرنگــی زۆری پێبــدرێت، تــا منداڵەکانیان بە باشی گەشە بکەن و لە باشترین لق و پۆپەوە بکەونەوە. جووتیار لــە کاتی کێڵاندا زۆرترین هەوڵ دەدات و بایەخی زۆر بە تۆوەکان دەدات، بــۆ ئــەوەی لــە زەوییەکی بە پیت و باشدا بیچێنێت، بە هیوای ئــەوەی زۆرتــرین و باشــترین بەرهــەم بچنێتەوە، ئامادەیە لە پێناو پاراستنیدا لەگەڵ نەیارانی بچێتە شــەڕەوە و وا بکــات خەڵکی پیایدا هەڵبدەن!

پێویستە مێردیش بایەخ بە ژنەکەی بدات، بە هەمان شێوەی کە جووتیار بایــەخ بە زەوییەکەی دەدات، کە بەرهەمی بۆ دێنێــت. کاتێــك ئەرەســتۆ باســی پێویســتی خواردن دەکــات راشــکاوانە دەڵێــت: (دەبێــت هــەموو چــاوێکمان لــە ســەر دایکــی منداڵەکانمان بێت، کە تۆوی تێدا دەچێنین تا رۆحی زیندووی لێــوە دەرچــێت بۆمــان، تەنیا بەم شێوەیە هەموو فانییەك بەشداری لە نەمرییدا دەکــات و بــەردەوام نــزا لــە خواوەندانی پێشین دەکات، ئەوەشی وا نەکات گاڵتەی بە خواوەند کردووە)[٢٢٩].

ژنی باشیش کاتێك خەڵکی دەبینن پیاوەکەی دڵسۆزە بۆی و تەنیا ئەوی بە دڵە، زیاتر رێزی لێدەگرن، چونکە خۆشیدەوێت و متمانەی پێ دەکات، بۆیــە پێویســتە ژن هەوڵ بدات بەو جۆرە بێت کە مێردەکەی دەیەوێت.

هەروەها ئەرەستۆ دەیەوێت پیاویش بەڕێز بێت، کاتێك دەڵێت ئاقلانە نییە پیــاو ناوی خۆی بە ناوی منداڵی ناشەرعییەوە بلکێنێــت، یــان هــەر ژنێکــی دەســتکەوت لەگەڵی بخەوێت، ئەگەرنا ئــەو (منداڵــە زۆڵــە)ی دەیخاتــەوە، لــە مافەکانــدا دەبێتــە هاوبەشی منداڵە شەرعییەکان و ژنەکەشی[٢٣٠].

مێردیش دەبێ لە مامەڵەکردنی ژنەکەیدا ڕەچاوی چەند شتێکی گرنگ بکات:

١- کاتێك سەرزەنشتی ژنەکەی دەکات، پێویستە وشەی ڕێزدارانە هەڵبژێرێت و دەستەواژەی شیاو بەکاربهێنێت و وتەی جوان بێت، نابێت وشەی بازاڕی بەکاربهێنێت.

٢- دەبێت لە هەڵەی نائەنقەستی ژنەکە، یان هەر هەڵەیەکی بچووکی تر، کە دەیکات ببورێت، ئەگەر بە نەزانین هەڵەیەکی کرد، دەبێت دوور لە هەڕەشە و گوڕەشە ئامۆژگاریی بکات.

٣- دەبێت بە سەر خۆیدا زاڵ بێت و ئاگای لە کردەوەکانی خۆی بێت، بەم شێوەیە دەبێتە باشترین ڕێنمونیکەری ژنەکەی لە ژیانیدا.

٤- دەبێت خود-کۆنترۆڵی ببەستێتەوە بە شەرم و خۆشەویستی و ترس و لە خۆبووردوییەوە. بەمەش هۆمیرۆس وەسفی هێلین دەکات، چونکە بەم شێوەیە لەگەڵ پریامدا دوا: (خەزووری ئازیزم، تۆ پیاوێکی ڕێزی دەگرم و لێشی دەترسم) مەبەست لەوەیە، کە خۆشەویستییەکەی تێکەڵ بە ترس و سڵکردنەوە[٢٣١].

لە لایەکی ترەوە ئۆلیس بەم شێوەیە لەگەڵ ناوسیکا دوا[٢٣٢]: (خانمەکەم، سەرسامی و ترس سەراپایان تەنیوم). ئەوەش چونکە هۆمیرۆس پێی وابوو ئەمە هەستی ژن و مێردیشە بەرامبەر یەکتری و لەمەشدا خێری هەر دوو لای تێدایە، کەس ئاوا شەرمنانە لە کەسێکی هیچ و پوچ ناترسێت، بەڵکو ئەمە هەستی ڕۆحە مەردەکانە بەرامبەر یەکتری.

هەر ئەوەش بوو هەستی ئۆلیس بەرامبەر پینیلۆپی ژنی، بۆیە بە درێژایی سەرکێشییەکانی لە ڕێگەی گەڕانەوەدا بە دڵسۆزی بۆی مایەوە[٢٣٣] لە کاتێکدا ئاگامەمنون لەبەر کریسیس[٢٣٤] ناپاکیی لە ژنەکەی کرد، کاتێك لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا رایگەیاند کە ژنێکی سۆزانی و لە ڕەگەزێکی بیانی لە ئیمتیازی مێینایەتیدا لە ژنەکەی (کلیتمنسترا) کەمتر نییە. ئەمەش کارێکی نەشیاوە لەگەڵ دایکی

منداڵەکانیدا، چۆن دەبێت وا بڵێت لـە کاتێکـدا ڕەفتـاری ژنەکـەی بەرامبـەر خـۆی نەزانیوە[235].

لە لایەکی ترەوە، ئۆلیس کاتێك کچەکەی ئەتڵەس لێی پاڕایەوە لەگەڵی بخـەوێت و لە بەرامبەردا نەمری بکات، ڕازی نەبوو لەبەر نەمریی ناپاکی لەو خۆشەویسـتی و وەفا و سۆزە بکات، کە ژنەکەی پێی دەبەخشێت، پێشی وابوو ئەو نەمرییەی کـە بـە ناپاکی دەکڕدرێت خراپترین جـۆری سـزایە[236] تەنانـەت کاتێـك خـۆی دایـە دەسـتی کیرکییەوە[237] تەنیا بۆ ڕزگارکردنی هاوەڵانی بوو، کاتێك ڕازیش بوو پێی وت کە هیچ شتێك هێندەی دوورگەکەی لە بەرچاوی خۆشەویست نییە، تەنانەت ئەگـەر بیابـان و وشکیش بێت، تەنیا دەیەوێت ژنەکـەی و کوڕەکـەی ببینێتـەوە، بـەم شـێوەیەش بـە دڵنیاییەوە دڵسـۆزی بـۆ ژنەکـەی خـۆی پاراسـت و ئـەویش وەك ئـەم بـە دڵسـۆزی چاوەڕوانی دەکرد[238].

ئەرەستۆ پێی وایە کـە هـۆمیرۆس بـە باشـی ئـەو شـەرەفە گەورەیـەی کـورت کردووەتەوە، کە پەیوەندی هاوسەرێتی بە پەیوەندی نێوان ژن و مێردێکی دەبەخشێت، کاتێك لە سەر زاری ئۆلیس بە ناوسکا دەڵێت: (تکـا لـە خواوەنـد دەکـەم، مێـرد و ماڵێکت لەگەڵ یەکێتییەکت لە دڵتدا پێ ببەخشێت، ئەمەش بەخششێکی گەورەیـە. هیچ لەوە گەورەتر نییە ژن و مێردێك لە ماڵێکـدا بـە خۆشەویسـتی و یەکێتییـەوە پێکەوە بژین، ئەمەش دەبێتە سوژن بۆ چاوی دوژمنان و دڵخۆشییەك بۆ هاوڕێیـانی، هەروەها هەریەکەشیان ئەویتر بە باشی دەناسێت)[239].

# کۆتایی

زۆر جار دەوترێت پەیوەندیی ژن و فەیلەسوف، بە درێژایی سەردەمەکان، پەیوەندییەکی خراپ و پڕ کێشە بووە، بە پێچەوانەی پەیوەندیی بە شاعیرەوە بۆ نموونە، یان هونەرمەند بە شێوەیەکی گشتی. رەنگە لە لێکدانەوەی ئەم پەیوەندییە خراپەدا بوترێت: فەیلەسوف لە بواری ئەبستراکتدا کار دەکات و بە ئاسمانی ئیدیاڵەکانەوە دەفڕێت، کەچی ژن بایەخ بە شتە هەندەکییەکان، بە سەرزەمینی واقیع دەدات.

ئەم پاساوە لە جێی خۆیدا دەبوو، ئەگەر باسی پەیوەندی خۆی و ژنەکەی بووایە، بەڵام بە خراپ باسی ژن بە شێوەی گشتی بکات، بە جۆرێك تەنیا وەك بوونەوەرێکی لە پیاو کەمتر تەماشای بکات، کە کاری تەنیا خزمەتی پیاو و بە خێوکردنی منداڵەکانی بێت (یان نەمرکردنی لە رێگەی منداڵ خستنەوەوە وەك ئەرەستۆ دەڵێت)، ئەمیان دەبێت لێکدانەوەیەکی تری بۆ بکرێت، کە بە رای من (هۆی ئەم جۆرە تێڕوانینە بۆ ژن) رازیبوونی فەیلەسوفە، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، بە دۆخی ژنی نێو کۆمەڵگاکەی لە سەردەمی خۆیدا. رەنگە روویەکی ئەم لێکدانەوەیە بۆ رازیبوونی ئەوە بێت، هەست دەکات ئەم دۆخە خراپەی ژن سوودی تیایە، وەك هەر پیاوێکی تر، دانانی ژن لە گۆشەیەکی بەرتەسکی ماڵدا، یارمەتیدەرە تا خۆی بۆ توێژینەوەکانی تەرخان بکات و بە ئاسماندا بە ئارەزووی خۆی بفڕێت!

بە درێژایی ئەم توێژینەوەیە بینیمان، کە ئەرەستۆ (تیۆریزە)ی دۆخی خراپی ژنی سەردەمی خۆی دەکرد، سەرەڕای بوونی چەند خانمێك لەو کەشە خنکێنەرەدا، کە زۆر زیرەك بوون و ئەقڵیان بە هێز بووە و بیریان تیژ بووە. لە کۆمەڵگایەکدا کە هەموو بەهرەیەکی ژنانی دەکوشت، تەنیا وەك خزمەتکاری باوك یان مێرد دانی پیا دەنان، چونکە پێنەگەیشتون و تەنیا کاری ماڵەوە شارەزان! لەگەڵ ئەمەشدا ئەرەستۆ

ژنانێکی ناسیوە کە بەم شێوەیە نەبوون: لە (پێلا)ی پایتەختی مەکدۆنیا ژنێکـی زۆر زیرەك و ئاقلی ناسی، کە خاوەن کەسایەتییەکی بـەهێز بـوو، ئـەویش ئۆلۆمپیاسـی دایکی ئەسکەندەر بوو، کە بەوە تۆمەتبار بوو گوایە لـە پشـت ئـەو پیلانگێڕییـەوە بووە، کە مێردە پاشاکەی (فیلیپ)ی تێدا کوژرا، تا کوڕەکەی بخاتە شوێنەکەی. ئـەم ژنە ئاسنینە لە پشت کوڕەکەیەوە دەوەستا و رۆحی مەزنایەتی و هێز و سـەرکەوتنی دەکـرد بـە بـەردا، هـەر کـاتێکیش لاوازی یـان دوو دڵییـەکی تێـدا دەربکەوتایـە، سەرزەنشتی دەکرد، لە کاتێکدا فیلیپی باوکی خەریکی ژن و شەرابی خۆی بوو، ئـەو لە ئامێزی دەگرت. لێرەدا نموونەیەکی دیارمان دەست دەکـەوێت لـە سـەر زاڵبـوونی هەڵچوون و شەهوەت بە سەر پیاودا، لەولاشەوە ئەقڵێکی بەهێز و بە توانا لای ژنێك دەبینین! ئەرەستۆ ئەم ژنەی باش دەناسی، چونکە دەهاتە سەردانی ئەو قوتابخانەیـەی کە ئەسکەندەر و هەندێك شازادەی تـری ولاتەکـەی تیایـدا دەیانخوێنـد، مامۆسـتای یەکەمیش کاتێك گالیسکە شـاهانەکەی دەگەیشـت بەتەکانـەوە دەچـووە پێشـوازی! لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز بە بیرەکانی خۆیدا دەربـارەی ژن نەچـووەوە. ئـەوەی مایـەی پێکەنینە ئۆلۆمپیاس ئەرەستۆی پێ باش نەبوو، قەناعەتی پـێ نـەدەهێنا. دەیـوت: (هیچ بیرێکی داهێنەرانەی نییە، لاواز و فسە زمانە).

ئەرەستۆ سافۆی شاعیریشی ناسیوە، کە سوکرات پێیوتووە (شـاجوان)، بەمـەش مەبەستی بلیمەتییەکەی بوو، ئەفلاتونیش دەربارەی دەڵێت: ئەو خواوەنـدی دەیـەمی هونەرە! هەروەها ئەو ژنە زیرەکەشی ناسیوە، کە بوو بە وێردی سەر زمـانی خـەڵکی ئەسینا، (ئەسپاسیا) کە هـاوڕێی پرێکلیسـی حـاکمی بـە ناوبـانگی ئەسـینا بـوو. مێژوونوسان دەگێڕنەوە کەماڵەکەی بوو بە جێگەی کـۆڕی کەسـایەتییە مەزنـەکانی ئەسینا، ئەوانەی دەهاتنـە ئێـرە: سـوکرات، ئـەفلاتون، فیـدیاس، ئەنکسـاگۆراس، سۆفۆکلیس و یوریپیدس بوون. تەنانەت لە مێـژوودا دەگمەنـە کـە ژنێـك هـۆڵێکی ئەدەبی لەم ئاستەدا هەبوو بێت. بگرە هەندێ لـە شـاعیران ناویاننـابوو (هـیرا) یـان خواوەندی شاژن!

ئەرەستۆ هاوسەردەمی ئەم کەسایەتییە درەوشاوانە بووە، هەر وەك بێگومان ئاگاداری وتەی ئەفلاتون بووە دەربارەی دیۆتیما و تیۆرەکەی لە سەر خۆشەویستی، کە لە گفتوگۆی (سیمپۆزیەم) دا باسیکردووە. کەچی هاتووە چاوی لە هەموویان نوقاندووە و بە زمانی سەر جادە باسیکردوون. جگە لەوەش، بە دوای پاساو و بەڵگەدا گەڕاوە تا تیۆرێکی کامڵی فەلسەفی دابنێت، کە لایەنە سەرەکییەکانی لە بیرۆکە میتافیزیکییەکانییەوە وەرگرتووە، کە بە راست و دوور لە گومانی داناون. دواتر هات و بە سەر بایۆلۆژیا و سیاسەت و ئەخلاقدا پراکتیکی کرد، تا ژن بکاتە (پیاوێکی نوقسان) کە جگە لە منداڵ خستنەوە و بەخێوکردنیان هیچ ئەرکێکی تری لەم دونیایەدا نییە. ئەوەی زۆر مایەی مەترسییە لە تیۆرەکەی ئەرەستۆدا ئەوەیە، پێی وایە سروشت کە کاری بێهودە و نابەجێ ناکات، ئەو ژنی وەها نزم خەڵقکردووە، خوو نەریت و کاری کۆمەڵگا، بە تایبەتی کۆمەڵگای پیاوسالاری، هیچ دەستێکیان لەم کارەدا نییە.

رەنگە بوترێت: جا چی تیایە؟ دەشێ فەیلەسوف لە چوارچێوەی سەردەمی خۆی دەرچێت؟ ئایا زیاد لە توانا داوا ناکەین لە ئەرەستۆ، کاتێك دەمانەوێت بە سەر بیرکردنەوەی سەردەمی خۆیدا سەربکەوێت و ژن لەو دۆخە نالەبارە رزگار بکات؟ ئایا هیگڵ نەیوتووە: هەموومان کوڕ و گۆشکراوی سەردەمی خۆمانین؟ ئایا تیۆرەکەی دەربڕی رای سەرجەم بیرمەند و شاعیران و هونەرمەندانی سەردەمەکەی خۆی نییە؟ ئێمەش لای خۆمانەوە دەڵێین:

ئەگەر بۆچوون و بیرکردنەوە و نەریتی کۆمەڵگای ئەسینایی لە رێزی ژن کەم دەکەنەوە، خۆ سۆفیستەکان رایان وابووە کە ئەم رایانە سروشتی و زگماك نین، بەڵکو بەدەستهاتوون، بە گۆڕانی کۆمەڵگا ئەمانیش دەگۆڕێن. رابەرەکەیان (پرۆتاگۆراس) لای وابووە مرۆڤ، نەك سروشت، پێوەری هەموو شتێکە. ئەمەش واتە ئەگەر ململانێیەك هەبووبێت لە نێوان لایەنگرانی سروشت، واتە زگماك و لایەنگرانی نەریت، واتە بەدەستهاتوو، ئەوا سۆفیستەکان سەرکەوتوون و رابەریش بوون تیایدا.

ئەگەر لە سەردەمی ئەرەستۆدا کەسانێك هەبن بیرەکان بگێڕنەوە بۆ نەریت و هیچیان بە کاری سروشت نەزانن، کە ئەرەستۆ بە بیرۆکەکانی هێندەی تر ماندوو و بار قورسی کردووە و رای وابووە کاری نابەجێ ناکات، چونکە پشتگیری فەلسەفەکەی خۆی دەکات. سەرەڕای ئەمەش ئەرەستۆ بیری سۆفیستەکانی رەتکردەوە و گاڵتەی پێکردن و بە توندی بەرەنگاریان بووەوە، تەنانەت رای وابووە کە شایەنی ئەوە نین پێیان بوترێت فەیلەسوف!

خاڵێکی تری جێگەی مەترسی لە تیۆرەکەیدا ئەوەیە، کە لەماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بە سەر بیری مرۆییدا بە مەسیحی و ئیسلامییەوە زاڵ بووبوو، ئەقڵی بیرمەندانی داگیرکردبوو. یان بڵێین: لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا دەگونجا، لەگەڵ نەریت و ترادسیۆنیاندا دەهاتەوە، بنەڕەتێکی فەلسەفی پێدان کە دۆخی ژن بە خراپی دەهێڵێتەوە. ئەم بیرانەش نەگۆڕان، تا کاتێك کۆمەڵگای ئەوروپی گۆڕا، بە تایبەتی لە ئینگلتەرا و سەدەی نۆزدەیەمدا. یەکەم کەسیش کە ئاڵای بیری لیبراڵی نوێی هەڵگرت، فەیلەسوفی ئینگلیزی جۆن ستیوارت میل (١٨٠٦-١٨٧٣ز.) بوو. ئەو کاتەی ئەندامی پەرلەمان بوو، شێرگیرانە داوای ئازادکردنی ژن و پێدانی مافە سیاسییەکانی دەکرد.

بەلاّم پێش ئەوە تیۆری ئەرەستۆیی هەر هەژموونی هەبوو، هەر چەندە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا مۆرکێکی دینی پێدرا. فەیلەسوفە مەسیحییەکان ژنیان، بە تایبەتی جەستەی، بەستەوە بە گوناهی دینییەوە، ژن بوو بە رەمزێك بۆ سێکس و وروژاندنی شەهوەت و (پەیامبەری شەیتان) و (دەروازەی دۆزەخ) و بنەمای خراپە و ئەو کەنارە لوسەی کە دەبێت پیاو وریا بێت نەکو بە هۆیەوە بخلیسکێت.

دەتوانی سەیرێکی دەوروبەی خۆت بکەیت و ببینی، کە زۆربەی بیرە ئەرەستۆییەکان جارێك مۆرکێکی دینی و جارێك مۆرکێکی کۆمەلاّیەتی و ئەخلاقییان پێدراوە، زۆربەشیان بە دەوری (سێکس) دا دەخولێنەوە. ئێمە لە ژیانی خۆماندا هیچ شتێك هێندەی سێکس بە خۆیەوە سەرقاڵی نەکردوین، ژنمان کردووە بە

بەرجەستەکەری سێکس، وەك بڵێی بە تەنیا بەو کارە هەستێت. ڕەنگە هۆکاری ئەمەش ئەو چەپاندنە زۆرە سێکسییە بێت کە هەمانە، یان کەموکورتیمان لە تێگەشتنی ئەم چەمکەدا، یان شێوەی خراپ و نەشیاوی پڕکردنەوەی ئەم غەریزەیە.

ئەگەر بایۆلۆژیا لای ئەرەستۆ گەیشتبێتە ئەوەی لای ژن، لایەنی نائەقڵی زاڵە بە سەر لایەنی ئەقڵیی نەفسدا، بۆیە دەبینین شەهوەت و هەڵچوون و هەستەکان و...هتد زاڵن بە سەریدا. ئێمەش بەبێ ئاگایی ئەم قسانە دووبارە دەکەینەوە بێ ئەوەی حساب بۆ پەروەردە بکەین، کە لە کۆمەڵگاکانی ئێمە و ئەوانی تریشدا ژن دەخاتە قاڵبێکی تایبەتەوە.

مارگرێت مید، زانای بەناوبانگی بایۆلۆژیا، لەو توێژینەوانەی لە سەر کۆمەڵگا سەرەتاییەکان ئەنجامیداوە ئەوەی سەلماندووە، کە جگە لە جیاوازییە بایۆلۆژییەکان هیچ جیاوازییەکی سروشتی، یان ئەوەی پێی دەڵێن (سروشتی نێر و مێ) لە نێوان ژن و پیاودا نییە. لە سێ کۆمەڵگای سەرەتاییدا کە توێژینەوەی لە سەر کردوون، مەسەلەکە بە تەواوی دەکەوێتە ئەستۆی پەروەردەی کۆمەڵایەتی. جگە لەوەش هەندێ پیاوان دەبینن هەڵچوون و شەهوەت زاڵن بە سەریاندا، لە کاتێکدا لای ژن وا نییە.

ئەگەر لە سیاسەتی ئەرەستۆدا ژن شیاو نەبێت بۆ ڕابەرایەتی یان سەرۆکایەتی یان حوکم، یاخود بەشداری لە بەڕێوەبردنی وڵات و دادپەروەری و...هتد. ئێمەش ئەم بیرۆکانە دەڵێینەوە و پێمان وایە ئەوەی بۆ ژن شیاوە و گونجاوە و دەبێت ژنی چاك پێیهەستێ، ئەوەیە (ژنی ماڵەوە) بێت. بگرە زۆر جار ئەمە بە ناوی ئیسلامەوە دەڵێین، لە کاتێکدا ئیسلام بە ئەقڵ و توانای ڕابەرایەتی کردنی ژندا هەڵدەدات. بۆ نموونە، تەماشای بەسەرهاتی (بەلقیس) لە قورئاندا بکە. دەبینین پێمان دەڵێت: شاژنێك هەبوو، بەڵام بە تەنیا حوکمی نەدەکرد و بڕیاری نەدەدا، بەڵکو گەورەکانی وڵاتەکەی بانگ دەکرد بۆ ڕاوێژپێکردنیان و ڕاگۆڕینەوە، بەوەش بنەمایەکی سیاسی گرنگی دانا، ئەویش ئەوەیە کە نابێ هیچ بڕیارێکی چارەنوسساز بدرێت، تەنیا پاش

هەڵوەستەکردن و بیرکردنەوە نەبێت: (قالت يا أيها الملأ افتوني في أمري ما كنت قاطعة أمرا حتى تشهدون) النمل: ٣٢.

تەنانەت ئایەتەکە باسی ئەوە دەکات، ئەو کەسانەی لە گەلەکەی کە بانگی کردبوون، لەو زیاتر بەپەلە و هەڵەشە و هەڵچوو بوون، ئەمەش چونکە سوربوون لە سەر دەستبەجێ بەکارهێنانی هێز: (قالوا نحن اولوا قوة و اولوا باس شديد و الامر اليك فانظري ماذا تأمرين) بەڵام ئەو زیاتر ئاقڵ و لە سەرخۆ بوو، ویستی پەنا بۆ شتێکی تر ببات، کە ئەویش بەخشش و...هتد بوو. دین وامان پێدەڵێت، بە ئێمە و بە هەر کەسێکی تریش کە بیەوێت بخوێنێتەوە و تێبگات، واقیعیش هەروامان پێدەڵێت. ئەوەتا (مارگرێت تاتشەر) لە ئینگلتەرا کە ناسراوە بە (ژنە ئاسنینەکە) چونکە کەسێکی رەقە و خاوەن بڕیارە، کەسیش نەیوتووە، کە بە هۆی هەڵچوون و شەهوەتەوە گەندەڵ بووە و شیاوی حوکم کردن نییە! ئەوەتا (بی نەزیر بۆتۆ) لە پاکستان کە تەنانەت پێش ئەوەی بێتە سەر حوکمیش، پیاوانی لادێکەیان دەهاتنە لای تا کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکات. هی تریش زۆرن: (ئەکینۆ) لە فلپین، (ئەندێرا گاندی) لە هندستان و (گۆڵدا مائێر) لە ئیسرائیل کە زووخاوی زۆرمان لە سەر دەستی ئەو چەشت، هەروەها هەموو ئەوانی تریش لە تورکیا و فەرەنسا و...هتد. جا ئەمانە هەموویان وامان لێناکەن پێش ئەوەی حوکمی وا بدەین، دوو جار بیربکەینەوە؟ ئایا لە نێوان ئەوەی لە واقیعدا دەیبینین و ئەوەی لە بیرماندایە هەست بە جۆرێك لە دژیەکی ناکەین؟ ئەرەستۆ، ئەخلاقی تایبەت بە ژن دەدات و فەزیلەتەکانیشی لە هی پیاو جیادەکاتەوە. ئێمەش هەروا دەکەین، ئەخلاق و فەزیلەتمان بە تایبەتی بۆ ژن، زۆربەی کات بە دەوری رەفتاری سێکسیدا دەخولێتەوە، مەبەست لە وشەی (شەرەف)یش لای ژن تەنیا پەیوەندییە سێکسییەکانە. ئەو شەرەفی نامێنێت ئەگەر بە شێوەی ناشەرعی سێکس بکات: کەچی ئەو کەسەی دزی دەکات، یان بازرگانی مادە هۆشبەرەکانە، یاخود گزی دەکات، دەکرێت ئەو کارانە بکات و شەرەفیشی بپارێزێت. بەڵام پیاو شەرەفی پارێزراو دەبێت، با رەفتاری

سێکسیی نەشیاویشی هەبێت، مادام ژنەکەی یان خوشك و دایکی و...هتد رەفتاریان جوان بێت... چ دواکەوتوییەکە!

ئێمە زۆرجار چاوپۆشی لە زۆرێك لە خراپەکان دەکەین، وەك: دزی، گزی، خۆپەرستی، ترسنۆکی و فرتوفێڵ و...هتد، چونکە فەزیلەتەکانی مرۆڤ وەکو مرۆڤ لامان بێ بایەخن، جا ئایا هەڵەین کاتێك دەڵێین: هیرارکییەتی ئەخلاقی ئەرەستۆیی هێشتا زاڵە بە سەرماندا؟ بەڵام لە کۆتاییدا دەبێت بڵێین: هەموو ئەمانە مانای وا نییە ئێمە هەستابین بە گواستنەوەی (تیۆری ئەرەستۆ دەربارەی ژن) یان بڵێین مامۆستای یەکەم، بێگومان ئەگەری کاریگەر بوونیش زۆرە، بەڵام بە زۆری هەڵوێستی پیاوان لە کۆمەڵگا پیاوسالارییەکاندا یەکێکە و پیاو زۆر سوود لە دۆخی خراپی ژن وەردەگرێت، رێك وەك چۆن ئازادەکان سوودیان لە سیستەمی کۆیلایەتی کۆمەڵگاکانی خۆیان وەردەگرت، هەندێ جار دواتر مرۆڤ بە لایەوە گرنگ نییە، کە بەم کارەی بووبێتە هۆی شکاندنی باڵێك و رێگرتن لە پێشکەوتنی، کە دەکرا هەموو کۆمەڵگا لێی سودمەند بن.

# سەرچاوەکان

1- Susan G .woman from the Greek to the French revolution. Stanford University press. 1973. P. 17

٢- بروانە د. محمد یوسف موسی بکە: (نظام الحكم في الاسلام)، دار الکتب العربی، ل ٥٤.

٣- احیاء علوم الدین. ب٢. ل ٦٤. دار الریان للتراث- قاهرة .١٩٧٨

٤- د. احمـد الخواجـة (الاداب التعاملیـة في فکـر الامـام الغـزالی) ل٤٧. المؤسسـة الجامعیة للدراسات و النشر- بیروت ١٩٨٦.

٥- احیاء علوم الدین. ب٢. ل٢٨.

٦- د.احمد الخواجة. الاداب التعاملیة. ل٤٨.

٧- تەنانەت مامانەکەش بەشێك لە بەرپرسـیارێتیی ڕەگـەزی کۆرپەلـەی دەکەوێتـە ئەستۆ. ئەگەر منداڵەکە کچ بێـت، نیـوەی حـەق دەسـتەکەی وەردەگرێـت و لـە دەرگای پشتەوە دەڕواتە دەرەوە. بگەڕێوە سەر وتارەکەمان بە ناوی (ذکر و انثی) لە کتێبەکەمان (أفکار و مواقف) دا.

٨- بـۆ نموونـە بـەراوردی ئەمـە بکـە: (خراپترینـی سـیفەتەکانی پیـاو، باشـترین سیفەتەکانی ژنن (ئـەوانیش): ڕژدیـی، لوتبـەرزیی، ترسـنۆکیی). احیـاء علـوم الدین. ب٢. ل٤٤. ئەمانەش هەمان بیرۆکـەی ئەرەسـتۆن کـە دەڵێـت: نـابێ ژن

فەزیلەتەکانی پیاوی هەبێت واتە نابێت بەهێز و ئازا و زیرەك و لێهاتوو و...هتد بێت. Aristotle: poetics, xv 1454-A .

یان: (بێدەنگیی تاج و زینەتی ژنە، بەڵام بۆ پیاو وا نییە) سیاسەت, ١٢٦٠ أ. ب٢ کۆی بەرهەمەکانی. ل١٩٩-٢٠٠.

٩- بگەڕێوە سەر کتێبەکەمان (افلاطون و المرأة) ل٢٦-٢٧ بە تایبەتی پەراوێزی ژمارە ٤١.

١٠- وێڵ دیورانت لە مێژووی شارستانیەتەکاندا دەڵێت: ژنی میسریی کۆن لە مارەبڕینیشدا ئیجابی بووە، چونکە ئەو دەست پێشخەریی دەکرد. ب٢. ل٩٨. ((زاڵبوونی ژنی میسریی بە سەر کاروباری تایبەتی خۆیدا، هۆکار بووە بۆ دەگمەن بوونی کوشتنی منداڵ)) ب٢ ل٩٨.

١١- گۆستاڤ لۆبۆن (الحضارة المصرية القديمة) ل١٣.

١٢- گۆستاڤ لۆبۆن، هەمان سەرچاوە، وەرگێڕانی محمد صادق رستم، المطبعة العصرية. هەروەها سەیری د. احمد الحوفی بکە (المراة فی الشعر الجاهلی) ل٧٠-٧١، دار نهضة مصر لە قاهیرە ١٩٨٠.

١٣- هەر چەندە لە سێ کارەکەی نەجیب مەحفوز ڕادەمێنم دەربارەی پیاوی ڕۆژهەڵاتی زاڵی فەرماندەر و نەهیکەر بە سەر ژنەکەیدا، کە لە کونجێکی ماڵە گەورەکەیدا بەندی کردووە تا بۆ خۆی لە دەرەوە خەریکی ئاهەنگ گێڕان و ڕابواردنەکانی بێت، یەکسەر وێنەی پیاوی ئەسینابیم بیر دێتەوە، کە ژنەکەی لە ماڵەوە بەند دەکات تا بتوانێت دەرچێت و ڕابوێرێت. ئەمەشمان بە درێژیی لە کتێبی (افلاطون و المراة) ل٢٤ و دواتردا باسکردووە.

١٤- ڕەنگــە کەســێك بڵێــت: بــۆ دەڵێــی کــە کەلــەپورێکی ئەرەســتۆییانەیە؟ لــە ڕۆژهەڵاتیش هەر وانەبووە جگە لە هەندێ حاڵەتی هەڵاوێرد بــە وێنــەی میســر و بابل؟ (پیاوی فارسی هاوشــێوەی شمــەك مامەڵــەی بــە ژنــەوە دەکــرد، تەنانــەت دەیتوانی حوکمی مەرگی بە سەردا بــدات) قاسـم امـین: تحریـر المـرأة، ل٢٣. لــە زۆربەی ناوچە ڕۆژهەڵاتییەکانیشدا جگە لە کاری ماڵەوە فێری هیچی تر نەکراوە، لە سەردەمی جاهلیشدا پێگەیەکی نزمی هەبووە، تەنانەت لــەدایکبوونی هۆکــار بوو بۆ هەناسە ساردیی و ترس، بگرە کوشتن و زیندە بەچاڵ کردنیش! وەك چۆن لە سپارتە دەنێردرا تا لەگەڵ غەیری پیاوی خۆیدا سێکس بکات، پیــاوی عــەرەبیش ڕازییە بەوەی منداڵەکە بە هی خۆی قبــوڵ بکــات! هــەروەها ئەگــەر مێردەکــەی بمردایە کوڕە گەورە وەك میراتی وەریدەگرت و دەبــوو بــە مێــردی و...هتــد. بــۆ وەڵامی هەموو ئەمانەش دەڵێم: بەڵێ وایە. کولتووری پیاوسالارانەی ڕۆژهــەڵات ڕقێکی زۆری لە ژن بوو، چاوەڕێی یۆنان نەبوو تا فێری ئەم کینەیەی بکات. بەڵام مەترسیی ئەرەستۆ لەوەدایە، کە ئەم ڕقــەی فەلســەفاندووە، پاســاوی ئــەقڵیی و سیاسەت و بایۆلۆژی و ئەخلاقی بۆ هێناوەتەوە. دوای ئەمە ئەو ڕقە لــە قــوڵایی نەستدا جێگیربوو، پشت بەست بــە کۆمــەڵێك بەڵگــە و ســەلماندن کــە هەنــدێك بەرگێکی دینیان بەبەرداکردووە!

١٥- ئەلفرێد ئێدوارد تایلۆر (ارسطو) ل١٧. وەرگێڕانی د. عزت قرنی. دار الطلیعة- بیروت ١٩٩٢.

16- Werner Jaeger. Aristotle translated by R . Robinson. P 303. Oxford University, 1967.

17- Ibid. p 323-3.

١٨- بارنزیش J.Barnes له نێو کۆکراوەی کارەکانی ئەرەستۆدا باسی دەکات، کە زانکۆی پرینستۆن ساڵی ١٩٥٨ بڵاویکردوەتەوە. ئەمەش تازەترین بڵاوکراوەی نووسراوەکانی مامۆستای یەکەمە (ئێمەش پشتی پێ دەبەستین و ئاماژەی پێ دەدەین) لەوێدا سەیری (دەقی) ڕاسپاردەکە بکە. ب٢. ٢٤٦٤. دیۆجینسی لایەرتی هەمان ڕاسپاردەی لە کتێبەکەیدا (حیاة اعلام الفلاسفة) ب١ ل ٤٥٥ و دواتردا بڵاوکردوەتەوە.

١٩- بەراوردی کۆکراوەی بەرهەمەکانی بکە. ب٢. ٢٤٦٤-٢٤٦٥.

٢٠- ئەفلاتون، گفتوگۆی یاساکان، ل٧٧٥ و لە وەرگێڕانەکەی جویت ب٤ ل٣٤٣.

٢١- بیگەر دەڵێ، گوایە ئەسکەندەر چەند پەیامێکی گرنگی پێدا ناردووە بۆ یۆنانییەکان. سەیری کتێبی ئەرەستۆ ل٣٢٠ بکە.

٢٢- هارۆڵد لامپ (الاسكندر المقدونی) . ل١٧. وەرگێڕانی عبدالجبار المطلبي، المكتبة الاهلية ببغداد.

٢٣- ن.تارن (الاسكندر الاكبر) ل١٢. وەرگێڕانی زكی علی و پێداچونەوەی د. **محمد** سليم سالم. مركز كتب الشرق الاوسط ١٩٦٣.

٢٤- هارولّد لامپ (الاسكندر المقدونی) ل١٨.

٢٥- هەمان سەرچاوە. ل٢٠.

٢٦- هەمان سەرچاوە. ل٢٩.

٢٧- دیۆجینسی لایەرتی ئاوەها باسی ئەرەستۆ دەکات: (ئەرەستۆ فسە زمان، قاچ باریك، چاو بچوك بوو. بە جلوبەرگ و ئەنگوستیلەکەی و ستایلی قژی سەرنجی

خەڵکی ڕادەکێشا) ب١ کتێبی (حیاة اعلام الفلاسفة) ل٤٤٥. وەرگێڕانی د.د. هیکس.

٢٨- هارولد لامپ (الاسکندر المقدونی) ل ٣٣-٣٤.

29- Aristotle: Metaphysics 980-A- the complete works vol.2 p.1552.

30- J.Lear: Aristotle: The desire of understanding p.1. Cambridge 1988.

31- Aristotle: Metaphysics 980-A (VOL.2. P. 1553).

32- Aristotle: Ethics 1139-B (vol. 2. p. 1799).

33- Aristotle: Ethics 1125-B (vol 2. p. 1809).

34- Susan M. Okin: women in western political thought p. 73

٣٥ بەراوردی توێژینەوەکەمان بکە: (افلاطون و المرأة) ل ٦٦ و دواتر.

36- Aristotle: politics. 1253-A (vol. 11. p. 1988).

37- Aristotle: ibid

٣٨- زاراوەی جیهانی هونەری لێرەدا مانایەکی فرەوانتری لە زاراوەکە هەیە، مەبەست پێی ئەو جیهانەیە کە مرۆڤ بۆ خۆی دەیخولقێنێت یان دروستی دەکات، هونەریش واتە ((دروستکردن)). مرۆڤ لەم جیهانەدا ئەوەی نزمە بۆ بەرژەوەندی و سوودی ئەوەی بالآیە دەیخولقێنێت. سروشت لە ڕێڕەوی خۆیدا ئەوەی نزمە وەك قۆناغێك بۆ گەیشتن بەوەی بالآیە دەخولقێنێت. بەراوردی ڕای ئێرنست پارکەر بکە لە سەر وەرگێڕانێکی کتێبی سیاسەتی ئەرەستۆ ل٣١٧ پەراوێزی ١.

39- Aristotle: politics. 1333-A (VOL. 2. P. 2115)

40- F. Bacon: the new organon p. 54 ed.by fuiton H Anderson- the bobs- merill. N.y. 1960

41- Aristotle: politics, 1333-A (the complete works vol. ip. 2115) Ibid: 1265-A (vol. 2 p. 1993)

42- Ibid: 1265-A (vol. 2 p. 1993)

٤٣- بەراوردی ئەوە بکە کە دەربارەی کەڵتەکان Celt دەیڵێت لە ئەخلاقی نیکۆماخیدا، بەوەی کە لە هیچ شتێك ناترسن، نە لە بومەلەرزە، نە لە شەپۆلەکانی دەریا Ethics: 1115-B (vol. 2 p. 1761)

44- Aristotle: politics, 1397-A (vol. 2 p. 2186)

٤٥- یوسف کرم (تاریخ الفلسفة) ل ٢٠٢-٢٠٣ دار القلم لە بیروت, ١٩٧٣.

٤٦- (ئەسکەندەر خۆی پێشتر دەیزانی کە ئەرەستۆ لەم ڕووەوە نەیپێکاوە، ئەو شارستانییەتیەی لە بابل و میسر بینی سەرسامیکرد. هەروەها بینی کە خانەدانانی فترس خەریکی جەنگن، بۆیە پێی وابوو هاوشێوەی یۆنانییەکان دەبێت بە پێی توانا و شیاویی خۆیان دابەشبکرێنە سەر چەند پلەیەکی جیاواز). و.و. تاون لە کتێبی (ئەسکەندەری مەزن: ژیان و مێژووی) ل٩٨. وەرگێڕانی زکی علی و پێداچوونەوەی د. محمد سلیم سالم، مرکز کتب الشرق الاوسط ١٩٦٣.

47- The politics of Aristotle eng. Trans by E. Barker p. 385

48- Aristotle: Politics, 1397-B (vol. 2 p. 2107)

٤٩- ئەرەستۆ پێی وایە ئەمە ڕای ئەفلاتونە.

50- Aristotle: Politics, 1264 (vol. 2 p. 1986)

51- D. Roth: Aristotle p. 241

52- Aristotle: politics, 1254-A (vol. 2 p. 1990)

53- Ibid

54- Ibid.

٥٥- John H. Randall: Aristotle p. 220 هەروەها دۆزینەوەی واقیع Discovering of reality وتارێکی لیندا لانچ: (المرأة لیستْ حیوانا ئاقلاً).

56 Aristotle: Politics, 1253-A (vol. 2 p. 1988)

٥٧- امام عبدالفتاح امام (فلسفة الاخلاق) ل ١٠٩-١١٠.

58- Susan M. Okin op. cit p. 77

59- Lynda Lange op. cit p. 12
60- Susan Okin op. cit p. 78

٦١- بێرتراند رەسڵ (تأريخ الفلسفة الغربية) ب ١ ل ٢٦٤. وەرگێڕانی د. زکی نجيب محمود - لجنه التأليف و الترجمه و النشر ١٩٧٨ چ ٣.

٦٢- ئەرەستۆ (الخطابة) وەرگێڕانی د. عبدالرحمن بدوی - دار الشؤون الثقافية العامة - بغداد ساڵی .١٩٨٦

63- John H. Randall: Aristotle p. 118
64- Aristotle: De Anima, 412 (vol. 1 p. 656)
65- Ibid, 415 (vol. 1 p. 661).

٦٦- ناتوانم ئەو تێبینییە باسنەکەم، کە ئەم بیرۆکە ئەرەستۆییە چەند کاریگەریی لە بیری هیگڵ کردووە، کە ئەویش هەبووەکان، بگرە شارستانی و هونەر و کولتوور و ئایینەکان و...هتد بە شێوەیەکی (سەر بەرەوژوورانە) لە سەر بنەمای پەیوەندی نێوان (ڕۆح و مادە) ڕێکخستووە. شارستانییەتەکانی ڕۆژهەڵات مادە تیایاندا زاڵ بوو، ڕۆح لە حاڵەتی خەودا بووە، کاتێك لە میسری کۆندا ویستویەتی لە مادە جیاببێتەوە. پەیکەری ئەبو هولیش ڕەمزە بۆ ئەمە کە نیوەی مرۆڤ (ڕۆح)ە و نیوەی تریشی ئاژەڵ (مادە)یە، کە ئۆدیب لە ئەفسانە بەناوبانگەکەدا لە بەر دەروازەکانی تیبەدا کوشتی، ئاوەهاش لە یۆنان ڕۆح لە مادە ڕزگاری بوو و...هتد.

٦٧- جورج سارتون: تاريخ العلم ،ب ٣ ل ١٥٢، دار المعارف.

٦٨- بەراوردی وتەکەی ویل دیورانت بکە: (بەڵام زانستی بایۆلۆژیا بواری ئەرەستۆیە، ئەو شارەزا و تێبینەرێکی گەورەیە، کەچی هەر لەوێشدا زۆربەی هەڵەکانی دەکات) قصة الحضارة ب ٧ ل ٤٩٩.

69- W.D. Ross: Aristotle, p.12 Meridian Book, N.Y, 1959

٧٠- (دارون: حياته و رسائله) له کتێبەکەی پێشتری ڕۆسەوە وەرگیراوە و جۆرج سارتۆنیش هەمان وتەی لە کتێبی (تاریخ العلم)دا باسکردووە ب ٣ ل ٢٧٧. دوو زاناکەش بریتین لە کارلۆس لینیس (١٧٠٧-١٧٨٨) زانایەکی ڕووەکناسی سویدییە بە دامەزرێنەری ڕووەکناسی دادەنرێت. بارۆن کۆفییەش (١٧٦٩-١٨٣٢) زانایەکی فەرەنسییە و بە دامەزرێنەری زانستی توێکاریی مۆدێرن دادەنرێت.

٧١- ویل دیورانت (قصة الحضارة) ب ٧ ل ٥٠٧.

٧٢- لەبەر ئەمەشە ئەرەستۆ زانیاری لە سەر ئەندامە ناوەکییەکانی گیانلەبەر زیاتربوو تا ئەوانی مرۆڤ. دەڵێت کە نە ئەو و نە ئەبیکراتس خۆیان لە ژێر کاریگەری و دەسەڵاتی دین ڕزگارنەکردبوو، تا جەستەی مرۆڤ توێ توێ بکەن. ویل دیورانت ب ٧ ل ٥٠٣.

٧٣- ئەم بەرهەمانە کاریگەری بەرچاویان لە سەر کەلەپووری عەرەبی هەبووە، بە تایبەتی جاحز و ئیبن قوتەیبە و نوەیری لە (نهایة الارب) و دومەیری لە (حیاة الحیوان) و...هتد. بۆ نموونە سەیری هێنانەوەی وتەکانی ئەرەستۆ بکە لە لایەن جاحزەوە لە کتێبی (الحیوان) دا. نصوص و دراسة بقلم د. ودیعة طە نجم، بڵاوکراوەی معهد المخطوطات العربیة بالکویت ١٩٨٥.

74- W.D. Ross: Aristotle, p.112

٧٥- ویل دیورانت (قصة الحضارة) ب ٧ ل ٤٩٩.

76- Aristotle: The complete works, vol 1, p.922

77- Ibid

78- H. Randall: Aristotle, p.46

79- Ibid
80- Lynd Lange: Discovering Reality, p.7

٨١- ئەرەستۆ بەردەوام وشەی نەفس Anima بەکاردێنێت، بەڵام ڕەنگە لێرەدا وشەی ڕۆح گونجاوتر بێت.

٨٢- چونکە ئەو بڕوای وابوو، وەك باسمانکرد، ڕادەی گەرمیی، بوونەوەرێك لە ڕیزبەندی هەبووەکاندا بەرز دەکاتەوە، ئەگەر کەم بکات هەبووەکەش نزم دەبێتەوە، ئەمەش بێگومان بیرۆکەیەکی هەڵەیە.

83- G. Bachelard, la formation de LEsprit scientifique p.18
84- Ibid
85- F. Bacon, The New Organon, p.45, ed. By Fulton H. Anderson, The Bobbs-Merill company 1960
86- W.D. Ross, Aristotle, p.117
87- Ibid
88- Aristotle, Generation of Animals 7- A
89- Susan Okin, Women in western political thought p.81

٩٠- هەروەها تەماشای ئەم وتە کورت و پوختەی بکە: (لەبەر ئەوەی هۆی کارا زۆر باشتر و پیرۆزترە لەو مادەیەی کاری لە سەر دەکات، بۆیە باشتر وایە بنەمای باڵا و کاریگەر لەوەی خوارەوە جیا بێتەوە، بە دواشیدا پێویستە پیاو چەندی بۆی لوا لە ژن جیا بێتەوە. (زاوزێی گیانلەبەران ٧٣٢-أ. ب ١ لە کۆی بەرهەمەکانی، بڵاوکراوەی بارنز ل ١١٣٦.

91- Aristotle, Generation of Animals 732-A.
92 Aristotle, History of Animals 588-A .

٩٣- ئەم پەیوەندییە لە فیکری یۆنانی و دواتـریش ڕۆمانیـدا هـەبووە، بـە بەڵگـەی ئەوەی وشەی نەفسی لاتینیAnima ، بووە بە سەرچاوە بۆ وشەی گیانلەبـەر لـە زمانە ئەوروپییە تازەکاندا وەك ئینگلیزی و فەرەنسی.Animal

٩٤- ئەرەستۆ (نەفس) ٤١٥-م- وە ل ٥٣-٥٤ لە وەرگێڕانی د. احمد فواد الاهوانی.

95- Aristotle, Generation of Animals 719-A.

٩٦- زانای فسیۆلۆژی ئینگلیزی ولیـەم هـارڤی (١٥٧٨-١٦٥٧) پزیشـکی پادشـا شـارڵی یەکـەم بـوو، ژمارەیـەك ئاسـکی مێینـەی لـە قۆنـاغی جیـاوازی دوای جووتبووندا توێ توێ کرد، بەڵام نە ئەو برە خوێنەی چاوەڕێ بوو، نە هیچ تـۆو و سپێرمێکی نەدۆزییەوە، ئەمەش توشی شڵەژانێکی گـەورەی کـرد، چـونکە ئـەو (هیلکۆکە)یەی کە لە گیانلەبەرە شیردەرەکاندا هەیـە ئـەو کـات نـەدۆزرابووەوە (ماوەیەکی زۆر دوای هارڤی دۆزرایەوە). ئێمـە ئێسـتا دەزانـین کـە خـوێنی ژن قۆناغێکە لە خـولی سێکسـی (الـدورة الجنسـیة)، کـە دەکەوێتـە قۆنـاغی دوای دەرچوونی هێلکۆکە لە هێلکەدان و نوسانی بە دیواری منالّدانەوە دوای پیتاندن. بگەڕێوە سەر وتەکانی Beck لە وەرگێڕانەکەی بـۆ کتێبـی زاوزێـی گیانلەبـەری ئەرەستۆ ل ١٠١. Aristotle, Generation of Animal, trans by. A.L. Beck, Harvard University 1942. سیمۆن دی بۆڤواریش دەڵێت: هـارڤی چـەند تاقیکردنەوەیـەکی تـری لـە سـەر چـەند دێڵـە سـەگێك دوای جووتبـوون ئەنجامداوە، لە نزیك ملی منالّدان چەند دیوە وای زانیوە کە هێلکۆکـەن، کەچـی کۆرپەلەی ڕاسـتەقینە بـوون. ل ٤٠ لـە کتێبەکـەی The second sex p.40 penguin books.

97- Aristotle, Generation of Animals 799-A.

٩٨- بۆ هەموو ئەمانە بگەڕێوە سەر (زاوزێی گیانلەبەران) ٧٢٩-ب وە ٧٣١-أ (کۆی بەرهەمەکانی ئەرەستۆ ب ١ ل ١١٣٥).

٩٩- هەمان سەرچاوە ٧٦٦-أ.

100- Aristotle, Generation of Animals 730-B.

١٠١- ئەمەش واتە پیاو لە کاتی زاوزێدا شتێکی مادی نابەخشێت بەڵکو ڕۆحییە. قەشە تۆمای ئەکوینیش ئەو تیۆرەی ئەرەستۆی بەکارهێناوە کە دەڵێت: پیاو شتێکی مادی نابەخشێت تا بەشدار بێت لە پێکهاتنی کۆرپەلەدا، بەمەش ویستویەتی بەرگری لە بیرۆکەی لە دایکبوونی مەسیح لە مریەمی پاکیزە بکات. الفرد تیلور (أرسطو) ل ٩٢ وەرگێرانی د. عزت قرنی دار الطلیعة بیروت ١٩٩٢.

102- Aristotle: OP. Cit.
103- Aristotle: Generation of Animals 764-A.
104- W.D. Ross, Aristotle, p. 121-122.
105- Aristotle, op. 767-B.
106 W.D. Ross, Aristotle, p. 122.
107- Ibid.

١٠٨- ئاشکرایە ئەمە ئاماژەیە بۆ حاڵەتی ڕژێنی منالْدان، ئەمەش ڕژێنێکی سروشتییە. بەراوردی زاوزێی گیانلەبەران ٧٣٩-أ بکە. هەروەها ٧٣٧-أ. بەڵام وابزانم بەشی کۆتایی دەربڕینەکە باسی شلەی سپی نێو منالْدان دەکات کە ئەمەش دەڕواتە چوارچێوەی پاسۆلۆژییەوە (زانستی نەخۆشییەکان) ئاشکرایە کە ئەم دووانە تێکەڵکراون، بەراوردی وەرگێڕانی Beck بکە چاپی زانکۆی هارڤارد ل ١٠٢ و دواتر لە زنجیرەی لۆیب .Loeb هەروەها سەیری ب ١ لە کۆی بەرهەمەکانی ئەرەستۆ ل ١١٤٣ و دواتر بکە، هەروەها ل ١١٤٦-١١٤٧ لە بڵاوکراوەی بارنز کە پێشتر باسکرا.

109- Aristotle: Generation of Animals 739-B.

١١٠- ((ئەرەستۆ وای زانیوە کە کۆرپەلە لە ئەنجامی یەکگرتنی سپێرم و خوێنی ژن دروست دەبێت و ژن تەنیا مادەی پاسیڤی پێدەبەخشێت، کەچی پیاو هێز و جووڵە و ژیـان و چـالاکی پێـدەدات. ئەبیکراتسـیش تیـۆرێکی هاوشـێوەی هـەبووە، وتوویەتی دوو جۆر تۆو هەن، یەکێکیان هی ژنە کە لاوازە، ئەوی تریان هی پیاوە کە بەهێزە. تیۆرەکەی ئەرەستۆ بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی تازە باڵادەست مایـەوە)). ل ٤٠ Simone De Beauvoir: The second sex .
p.40 Eng. Trans by. H.M. Parshley penguin books.

111- Lynda Lange: (women is not a rational animal) p.11 in discovering reality .

112- Aristotle: Generation of animals 767-B.

113- Ibid, 585-B.

114- Lynda Lange: op. cit. p. 11.

115- Ibid, p. 12.

116- Aristotle: Generation of Animals 721-B.

117- Ibid

118- Lynda Lange: women is not a rational animal p.11.

١١٩- بەراوردی ئەو چوار بەڵگەیە بکە کە لـە زاوزێـی گیانلەبەرانـدا دەیهێنێتـەوە ٧٢١-ب (ب ١ کۆی بەرهەمەکانی ل ١٢٠ و دواتر).

120- J.H. Randall, Aristotle, p.238 (Columbia university 1968).

121- Aristotle: Generation of animals 728-A.

122- Simone de Beavoir: the second sex p.38.

123- Ibid. 767-A.

124- Ibid. 767-B.

125- Ibid.

١٢٦- بەراوردی وتارەکەمان (ذکر و أنثی) بکە لە کتێبی (افکار و مواقف) مکتبة مدبولی- القاهرة.

127- Aristotle: Generation of Animals 726-B.

128- Aristotle: parts of Animals G 43-A.

١٢٩- بەراوردی وەرگێڕانە کۆنەکەی یوحەننا بەتریق بکە کە د. عەبدولرەحمان بەدەوی بڵاویکردووەتەوە بە ناونیشانی (أجزاء الحیوان) ل ٧١-٧٢، وکالة المطبوعات بالکویت ١٩٧٨.

130- Aristotle: Generation of Animals 728-A. (Complete works, vol.1p. 1130)

131- Lynda Lange, op. cit. p

132- The Ingredients of an Aristotelian science, nous, 6-pp. 55-59.

133- Quoted by Simone de Beavoir in "the second sex" p.24 trans by H.M. Parshley penguin (Cassics books, 1953).

134- Lynda Lange, op. cit. p. 7.

١٣٥- بیرۆکەکەی ئەرەستۆ تا سەردەمی تازە باڵادەست بوو، بە ڕادەیەك سەرسامی نیتچە (١٨٤٤-١٩٠٠) بە شارستانیەتی یۆنانی کۆن ڕەنگدانەوەی ئەو کاریگەرییەیە. لێرەوەیە دەڵێت: (ژن هیچ ئەرکێکی تری نییە جگە لە خستنەوەی منداڵێکی جوان و بەهێز، کە بەشێوەیەکی بەردەوام کەسایەتی باوکی تێدا بژێت) (أمور انسانیة الی أقصی حد) ل ٢٣٨.

١٣٦- ئەم تێڕوانینە بە شێوەیەکی تایبەتی لە سەردەمی ئەرەستۆدا بڵاوبوو، بە ڕادەیەك ئیڤا کیولز بە سەردەمی کلاسیکی یۆنانی دەڵێت (سەردەمی چووك)

تەماشــای کتێبەکــەی بکــە: Eva Keuls: "The Rrign of phallus: university of California press, 1993.

١٣٧- تا ئێستاش خەڵکی عەوامی لای خۆمان بە هەمان مانا بــەکاریان دێنێــت، ڕەنگە وشەکانی نێر، چووك و مرۆڤ بە هاومانا دابنێت!

138- Lynda Lange, op. cit. p. 12.

139- A Philosophical Dictionary of Biology p.27 ed. By P.B. Medawar, Weiden Feld, London 1984

140- Ibid, p. a7.

١٤١- ئەمە بەراوردکە بەو قسەیەی خەڵکی عەوام کــە دەڵــێن هەنــدێ گیانلەبــەر، لەوانەش پشیلە حەوت ڕۆحی هەیە!

142- Philosophical Dictionary of Biology, p.28.

١٤٣- جورج سارتون (تاريخ العلم) ب ٣ ل ٢٧٠. وەرگێڕانــی چــەند زانایــەك، دار المعارف لە میسر.

144- Eva Keuls: "The Rrign of phallus: sexual politics in Ancient Athens" p.145. university of California press, 1993

١٤٥- ئەو دەستەواژەیەی هیگڵ کە نووسەر ئاماژەی بۆ دەکات ئەمەیە: (هەموومان کوڕی سەردەمی خۆمانین، هەروەها بۆ فەلسەفەش دەشێ بوترێ کــە بریتییــە لــە سەردەمی خۆی لە قاڵبی فیکردا). ل ٨٨ لە (أصول فلسفه الحــق) وەرگێڕانــی د. امام عبدالفتاح امــام ســەیری بــەرگی یەکــەمی کــۆی کارەکــانی هیگــڵ بکــە، بڵاوکراوەی مکتبة مدبولی- القاهرة.

146- Susan Okin, women in western political philosophy p. 73.

١٤٧- د. امام عبدالفتاح امام (افلاطون و المراة) ل ٥٢، ژمــارە یــەك لــە زنجــیرەی فەیلەسوف و...ژن، مکتبة مدبولی- القاهرة.

١٤٨- (افلاطون و المراة) ل ٢٨، هەروەها سەیری ئیڤا کیولز (عصـر القضـیب) ل٩٩ بکە.

149- G.E.R Lioyd: Aristotle, The Growth and structure of Historical Thought, p.246. Cambridge University press, 1968.

١٥٠- دواتر بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەو دادپەروەرییەی ئەرەستۆ باسی دەکات و بە (زەرورەتێکی کۆمەڵایەتی) بگرە بە زەرورەتـی گردبوونـەوەی سیاسـی دادەنێـت، تەنیا لە نێوان ئەوانەدا دەشێ هەبێت کە یەکسانن یان بەرامبەرن یان هاوشـانن، واتە ئەوانەی بە یەکسانی دەتوانن حوکم بکەن و حوکم بکـرێن، لـەم حاڵەتەشـدا ستەمە کە ئەمانە بە ڕێگەیەکی تری جگە لە یەکسانی مامەڵە بکرێن.

151- Aristotle, Politics, 1252-B (vol. 1. p. 1987).

152- Ibid.

153- Ibid, 1252-B.

154- Ibid, 1252- (VOL. 2. P. 1985).

١٥٥- ئەرەستۆ ئەمەی بە ڕای ئەفلاتون دادەنا، سەیری وتەی ئێرنست پارکەر بکە لە وەرگێڕانی بۆ کتێبی سیاسەتی ئەرەستۆ ل ١ پەراوێزی ٢.

156- Aristotle, Politics, 1257-A (vol.2 p. 1986).

١٥٧- ئەرەستۆ گەلانی دونیا دابەش دەکات بۆ سێ جۆر:

أ) گەلی ناوچە ساردەکانی ئەوروپا.

ب) گەلی ئاسیا.

ج) گەلی یۆنان.

یەکەم: ڕۆحێکی بەرزیان هەیە و ئازان، بەڵام زیرەکی و دەستڕەنگینیان کەمە، ئەمەشە هۆی ئەوەی تاڕادەیەك ئازادی خۆیان پاراستووە، بەڵام سیستەمی سیاسییان هیچ پێشکەوتوو نییە، نەشیانتوانیوە حوکمی ئەوانی تریش بکەن.

دووەم: زیرەك و دەستڕەنگینە، بەڵام ڕۆحی بەرز نییە و ترسنۆکە، بۆیە هەمیشە لە ژێر باری کۆیلایەتیدا نرکاندویەتی، لای ئەوان جیاوازی نییە لە نێوان ژن و کەنیزەك، یان پیاو و کۆیلەدا، چونکە هەموویان کۆیلەن.

سێیەم: گەلی یۆنانییە کە هەردوو خەسڵەتەکەی هەیە: لە نێوان زیرەکی و ڕۆحی بەرزدا، لە نێوان دەستڕەنگینی و ئازایەتیدایە، ئەم سیفەتانەش وایان لێکردووە کە بەردەوام ئازاد بێت و یارمەتیان داوە سیستەمێکی سیاسی پێشکەتووی هەبێت، ئەگەر یەکێتی سیاسی هەبووایە دەیتوانی حوکمی گەلانی تریش بکات، کەچی ئەم جیاوازییانەی نێوان گەلی یۆنانی و گەلانی تر، لە ناوخۆی گەلی یۆنانی خۆشیدا هەیە (سیاسەت ١٣٢٧-ب) وە (کۆی بەرهەمەکانی ب٢ ل٢١٠٧).

158- Aristotle, Politics, 1327-B (vol. 2. p. 2107).

١٥٩- یوسف کرم: تاریخ الفلسفة الیونانیة ل ٢٠٢-٢٠٣ دار القلم، بیروت ١٩٧٧.

160- Aristotle, Politics trans. By. E. Barker PXV111.

161- Ibid, 1255-A (vol. 2 p. 1991).

162- Ibid.

١٦٣- دەکرێت مافەکانی ژن لە کۆمەڵگای ئەسینایيدا لە یەك ڕستەدا کورت بکەینەوە: هیچ مافێکی نەبووە! هەر داواکارییەکیشیان هەبووایە لە ڕێگەی سەرپەرشتیارانەوە دەیانکرد. زینۆفۆن گفتوگۆیەکی نێوان ئیزخۆماخۆس و

سوكرات دەگێڕێتەوە، كـە یەكـەم ژنـان دەچـوێنێ بـە كۆیلـە و ئەسـپ، كەچـی دووەمیان دەیانچوێنێ بە وڵاخ و ئەسپ. لە ڕاستیدا ژن لە قانونـدا هێنـدەی وەك كۆیلە مامەڵە دەكرا، هێندە وەك كەسێك مامەڵە نەدەكرا. ئەوان ژیانیان بـەوەوە دەگوزەرێنن لە سەرپەرشتی پیاوێكەوە بگوازنەوە بۆ ژێر سەرپەرشتی پیاوێكی تر: سەرپەرشتیاریش دەشێ باوك، مێرد، كوڕ، برا یان خزمێكی دووری نێرینە بێـت. ئەوانیش هەروەك كۆیلە لە دیدی ئەرەستۆ دا، ئامێری زیندوون كە موڵكی پیاون و بەكاریاندەهێنێت.Eva Keuls, The Reign of Phallus p.102

164- Aristotle, Politics, 1961 (vol. 2 p. 2001)
165- Aristotle, 1962- A (vol.2 p. 2002)
166- Aristotle, 1962- A (vol.2 p. 2002)
167- Aristotle, Politics, 1264-A (vol.2 p. 1989).
168- Ibid.
169- Ibid.
170- Ibid. 1254-B.
171- Ibid.
172- Ibid, 1259-A (vol.2 p. 1998).

١٧٣- ویل دیورانت (قصة الحضارة) ب٦ ل ١٥٧ لە وەرگێڕانی محمد بدران.

174- Aristotle, Economics, 1344-A (vol.2 p. 1931).
175- Ibid.
176- Ibid.

١٧٧- تەماشاكە چێژی سێكسی وەك ڕەگەزێك لە ڕەگەزەكانی هاوسـەرگیریی نـاوی نییە، چونكە ئەویان جێهێڵراوە بۆ سۆزانی و كوڕانی لوسكە، بەڵام ژن تـەنیا بـۆ خستنەوە و بەخێوكردنی منداڵـە. بـۆ وردەكـاری زیـاتر سـەیری كتێبـی (عصـر القضـیب)ی ئیڤـا كیـولز بكـە كـە دەڵـێ: (وەزیفـە و ڕۆڵـی هەسـتیاری ژن لـە

کۆمەڵگای ئەسینابیدا بریتیە لە بەخێوکردنی منداڵ، بە تایبەتیش کوڕان، چونکە باوک گرنگی بە کچ نەدەدا) ب ١٠.

178- Aristotle, Economics, 1344-A (vol.2 p. 2131).

179- Aristotle, Politics, 1259-A.

١٨٠- بە شوودانی زوو باو بوو لە کۆمەڵگای ئەسینابیدا، چونکە کچی منداڵ گوێڕایەڵە و بە ئاسانی کۆنترۆڵ دەکرێت، بۆیە کچان لە تەمەنی پانزە ساڵیدا دەدران بە شوو، کەمینەیەکی کەمیش لە ڕۆشنبیرە منەوەرەکان داوای ئەوەیان کردووە کە تەمەنی سروشتی بۆ هاوسەرگیریی بکرێتە هەژدە ساڵ، وەك ئەوەی ئەرەستۆ کردی. بەڵام ئەفلاتون بیست ساڵی پێ باش بوو وەك ئەوەی لە سپارتا هەیە. کەچی سوکرات دەیوت: کچێك بخوازە کە هیچی نەبیستبێت و نەبینیبێت. (عصر القضیب) ل ١٠٤.

181- Aristotle, Politics, 1259-A.

182- Aristotle, Politics, 1335-A (vol.2 p. 2118).

١٨٣- سێر ئێرنست وشیاریمان دەداتێ، کە ئێمە کاتێك دەقەکانی ئەرەستۆ تایبەت بە هاوسەرگیریی دەخوێنینەوە، دەبێت ئەوەمان لە یاد بێت کە ئەو کوڕی پزیشك بووە و ڕاهێنانی پزیشکی باشی وەرگرتووە، وادیارە لێرەدا مەبەستی لە وشەی تۆو، سپێرمەکان (گیانلەبەری مەنەوی) بێت، ئەمەش لە تەمەنێکی دیاریکراودا گەشەی تەواو دەبێت، بۆیە ئەگەر کوڕێك هەر زوو خەریکی تێرکردنی لایەنی سێکسی خۆی بێت پێش تەواوبوونی گەشەیان، ئەو کات زیان بە هەموو جەستەی دەگەیەنێت، بۆیە مەرجی داناوە هاوسەرگیریی پیاو لە تەمەنی سی و حەوت ساڵیدا بێت.

184- Aristotle, op. cit. 1335-A.

١٨٥- خەڵکی ئەسینا مانگێکیان هەبوو پێیان دەوت (مـانگی هاوسـەرگیریی) لـە ناوەڕاستی کانونی یەکەمەوە دەست پێ دەکات تـا نزیکـەی ناوەڕاسـتی کـانونی دووەم.

186- Aristotle, Politics, 1335-A (vol.2 p. 2118)
187- Ibid.

١٨٨- بێگومان ئەم تێبینیەی ئەرەستۆ ڕاستە لەوەدا کە منداڵ کاریگەر دەبێـت بـە باری تەندروستی دایك، جـا بـاری جەسـتەیی بێـت یـان دەروونـی. فەیلەسـوفی ئینگلیزی تۆماس هۆبز ترسی هەمیشەیی دەگەڕاندەوە بۆ ئەوەی کە دایکی پێش کاتی خۆی ئەمی بووە، چونکە لە هێرشی ئیسپانییەکان زۆر ترساوە ئـەو کاتـەی لە کەنارەکانی ئینگلتەرا نزیك کەوتنەوە. لـە ژیاننامـەی خۆیـدا دەڵـێ: دایکـم دوانەیەکی بە جارێك بووە (من و ترس). (تەماشای کتێبەکـەمان بکـە تومـاس هوبز ل ٤٥ دار التنویر بیروت ١٩٨٥). بەڵام ئـەو ئامۆژگارییـەی کـە دەیکـات بەوەی با ئەقڵی دایکەکە بە تەواوی لە کار بخرێت و ماندوو نـەکرێت زۆر سـەیرە! ئاشکرایە وەك ئێرنست پارکەر دەڵێ: ئەرەستۆ لێرەدا بڕوای تەواوی بە تیۆرەیەکی مادی فیزیکی لە سەر ژن هەیە، دونیای یۆنـانی دونیایـەکی پیاوسـالارانە بـوو، دەیویست دایك وەك زەوی بێت کە تۆوی تێدا سەوز دەبێـت، خـۆڕاگر بێـت، زۆر گلەیی و بۆڵە نەکات و بیریش نەکاتەوە.

١٨٩- فڕێدانی منداڵ لە دەشـت و دەر بـە تایبـەتیش لـە سـەر لوتکـەی چـیاکان، کارێکی نامۆ نەبوو بە یۆنانییـەکان. زۆرجـار ڕوویـدەدا پاڵـەوان (ی مێینـە) ی یەکێك لـە شـانۆگەرییەکان یـان حیکایەتـە یۆنانییـەکان کەسـێکی هـەڵگیراوە

(لقیگ) بوو کە بەم شێوەیە دۆزرابوویەوە. چونکە کچـان زیـاتر لـە کـوڕان بـەم شێوەیە لە دەشتەکاندا فڕێدەدران. وشەی هەڵگیراوەیش بۆ خۆی واتـە منـداڵێك، کە لە سەر ڕێگەکان دەدۆزرێتەوە و باوانی خۆی ناناسێتەوە، واتە لە سـەر ڕێگـە هەڵدەگیرێتەوە پاش ئەوەی خەریك بووە بمرێت.

190- Aristotle, Politics, 1335-B.

191- Ibid.

192- Ibid.

193- Ibid.

١٩٤- ئەرەستۆ: سیاسەت ١٢٦٠-أ. وا دیارە ئەرەستۆ لێرەدا کەوتوەتە بازنەیـەکی لۆژیکییەوە (دور منگقی) ئەو لەسەرەتادا دەڵێت، کە پەیوەندی نێوان کەسـەکان وەك پەیوەندی نێوان ڕەگەزەکانی نەفس وایە، پاشان لەوێوە دێتەوە سەر پەیوەندی نێوان کەسەکان، ناوەندی ئەم سوڕانەوەش بریتییە لە بنـەمای گشـتی پەیوەنـدی نێوان حاکم و مەحکوم.

١٩٥- ئەرەستۆ: سیاسـەت ١٢٦٠-ا. لـە کتێبـی حەوتـەمی سیاسـەتدا ئەرەسـتۆ وێنەیەکی تەواوی هەردوو ڕەگەزەکەی نەفس (حاکم و مەحکوممان) نیشان دەدات.

١٩٦- هەمان سەرچاوە، هەمان جێگە.

١٩٧- بۆ نموونە تەماشای وتەی ئۆگەستینۆس رەبارە وەرگێڕی (سیاسـەت) بکـە لـە سەدەی بیستدا کە دەڵێت: (ڕەگـەزی مێینـە هەسـتی ناسـکە و سـۆزاوییە، زوو کاریگەر دەبێت، زیاتر گوێڕایەڵی هەسـتەکانە و شـوێن نـوری ئـەقڵ ناکـەوێت. کەوابێت لە پیاو کـەمتر شـیاویی ئـەوەی تیایـە سـەرۆکایەتی بکـات، چـونکە سەرۆکایەتیکردن کارێکە لە یاسا و ڕێسای خۆیدا پشت بە ئەقڵ دەبەستێت نـەك

هەست. بەڵام ڕەنگە پەروەردە ئەم کەموکوڕییە سروشتییە پڕ بکاتەوە، هەر چەندە هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە ئەوەی سروشتییە بە سەر ئەوەی بەدەست هاتووە زاڵ بێت). ل ٣٧ پەراوێزی ١. ئەو لە کاتێکدا ئەم قسەیەی کردووە کە ژمارەیەکی بە ناوبانگی ژن هەبوون لە جیهاندا! تاتشەر لە ئینگلتەرا کە لەبەر بەهێزی و ڕەقی نازناوی ژنە پۆڵاییەنەکەی وەرگرتبوو، هەرگیزیش هەست و سۆز زاڵ نەبوون بە سەریدا. بی نەزیر بۆتۆ لە پاکستان کە تەنانەت پێش ئەوەشی بێتە سەر حوکم لە زۆربەی پیاوان ئاقلتر بوو، ئەندێرا گاندی لە هندستان ، ئەکیبۆ لە فلپین و...هتد، ئەوەشی کە گۆڵدا مائێر پێیکردین بۆ خوێنەری عەرەبی جێدەهێڵم تا بێتەوە بیری.

١٩٨- تەماشای وتارەکەی بکە: Aristotle and Politiciazation of the soul (in discovering reality) p. 17-30 ed. By Sandra Nerding.

199- Aristotle, Ethics, 1119-B.

٢٠٠- ئەخلاقی نیکۆماخی ١١٤٩-ب. دەوترێ کە دێڕەکە هی سافۆی شاعیرە، وەسفەکەش بۆ ئەو کەنارەیە کە لێی دابەزیوە پاش ئەوەی لە دەریا هاتووەتە دەرەوە. تەماشای د. عبدالغفار مکاوی بکە (سافو: شاعرة الحب و الجمال عند الیونان) ل ٧٢ پەراوێزی ١، دار المعارف لە میسر، ساڵی ١٩٦٦.

٢٠١- ئەخلاقی نیکۆماخی ١١٣٨-ب.

٢٠٢- هەمان سەرچاوە ١١٦٨-ب.

٢٠٣- هەمان سەرچاوە ١١٦٩-ب.

204- E.V. Spelman, op. cit. p. 21.

205- Aristotle, De Anima, lo 8-B.

206- E.V. Spelman, op. cit. p. 21.
207- E.V. Spelman, op. cit. p. 23-4.
208 - Eva Keuls, The Reign of phallus p. 6 .
209- Susan Okin, Women in western political thought, p. 86.
210 -Aristotle, politics, 1259-B.
211 - Ibid.
212- Ibid.
213- Aristotle, Economics, 1353-B (vol. 2 p. 2146).

٢١٤- بەراوردی بکە بەوەی ئیمامی غەزالی دەڵێت: (هەموان کۆکن دەربارەی ژن بەوەی دەبێت لە ماڵەوە دانیشێت و زۆر دەر و دەشت نەکات...هەرچیشی توانی ئەنجامی بدات...کە مێردی لێ نەبوو داوێنپاکی خۆی بپارێزێت، لە هەموو کارێکیدا دوعای سەرکەوتن و بەختەوەری بۆ مێردەکەی بکات و...هتد.) احیاء علوم الدین، ب٢ ل ٦٦، دار الريان للتراث- القاهرة .١٩٨٧

٢١٥- (ئەگەر هاوڕێیەکی مێردەکەی لە دەرگای دا و مێردەکەش لە ماڵ نەبوو، نابێت ڕێگە بدات بێتە ژوورەوە و قسەی لەگەڵ بکات، لەبەر خاتری خۆی و مێردەکەشی). هەمان سەرچاوەی پێشوو ل .٦٦

٢١٦- (کەم قسە لەگەڵ دراوسێکانی بکات، مەگەر کاتی پێویستی ئەگەرنا نەڕواتە ماڵیانەوە). هەمان سەرچاوە.

٢١٧- (مافەکانی مێرد لە سەر ژن زۆرن، گرنگترینیان دووانن: خۆپاراستن و خۆگرتنەوە- لە کاری خراپ- لەگەڵ داوانەکردنی شتێك کە لە توانای مێردەکەدا نەبێت). هەمان سەرچاوە ل ٦٥.

٢١٨- (یەکێك لە مافەکانی مێرد لە سەر ژن ئەوەیە دەست بە ماڵییەوە بگرێت و زیادەڕۆیی تێدا نەکات). هەمان سەرچاوە ل ٦٥.

٢١٩- (نابێت ژن لەبەر جوانی بە سەر مێرددا بنازێت، یان لەبەر ناشیرینی مێردەکەی ببێزێنێت). هەمان سەرچاوە ل ٦٧.

٢٢٠- (پێویستە ژن بزانێت کە گوێڕایەڵیکردنی مێرد یەکێکە لە بنەماکانی ئیسلام). هەمان سەرچاوە ل ٦٤.

221- Aristotle, Economics, 1353-A (vol.2 p. 2147)

222- Ibid.

223- Aristotle, Ibid.

٢٢٤- ئەلکستیس، ژنی ئەدمیتۆسی پادشای تساليا بوو، کە توشی نەخۆشییەکی درێژخایەنی کوشندە بووبوو، داوای لە خواوەند کرد کە نەمریی پێ ببەخشێ و مردنی لێ دوور بخاتەوە. ئەویش ڕازیبوو بەو مەرجەی لە کاتی مردندا، کەسێکی نزیکی بهێنێت تا لە جیاتی ئەم بمرێت. بەم جۆرە ژنە دڵسۆزەکەی هاتە پێشەوە و خۆی کرد بە قوربانی پادشای مێردی. کاتێك هێرکولیس بە تسالیادا تێپەڕی، بینی وا پادشا و گەلەکەی بۆ ژنەکەی دەگرین، ئەویش ڕۆشتە تاریکییەکانی ئەو دونیای ترەوە و لەگەڵ پاسەوانە بەهێزەکەیدا جەنگا، ژنە دڵسۆزەکەی هێناوە بۆ مێردەکەی، هەموو مەملەکەتیش بەو بۆنەیەوە کەوتنە خۆشی!

٢٢٥- پینیلۆپ، کە ڕێسەکەی کردەوە بە خوری، ژنی ئۆلیسی سەرکردەی گەورەی یۆنانی نێو جەنگی ترۆی بوو، هۆمیرۆس (ئۆدیسە)ی دەربارەی ئەمەی نووسیوە و تیایدا باسی گەڕانەوەی دەکات بۆ وڵات پاش تەواوبوونی جەنگەکە. ئۆلیس ڕاستەوخۆ نەگەڕایەوە بۆ وڵات، بەڵکو چەندین کۆسپ و تەگەرە هاتنە ڕێی و لەگەڵ ژمارەیەك سەربازدا سەرکێشیی زۆریان توشبوو، بەردەوام بۆ ماوەی نزیکەی بیست ساڵ بە وڵاتدا دەسوڕایەوە. لەو ماوەیەشدا خوازبێنیکەری زۆر

دەهاتنە خوازبێنی ژنەکەی، لەبەر ئەوەی گوایە مێردەکەی لـە شـەڕدا کـوژراوە، ژنێکی وا جوانیش گوناهە بێ مێرد بمێنێتەوە. بـەڵام پینیلـۆپ هەسـتی دەکـرد مێردەکەی نەمردووە و زوو بێ یان درەنگ هەر دەگەڕێتەوە. بۆیە پەنای بردە بەر خۆخەریککردن و فێڵ بۆ وەڵامدانەوەی خوازبێنیکەران، بەڵێنی ئەوەی پێدان کـە پاش ئەوەی لە چنینی جلێـك دەبێتـەوە یـەکێکیان هەڵبـژێرێت، بـەڵام هـەموو ئێوارەیەك ئەوەی بە ڕۆژ چنیبووی هەڵیدەوەشـاندەوە و بـۆ ڕۆژی دواتـر دەسـتی دەکردەوە بە چنین، بەم شێوەیە مایەوە تا مێردەکەی گەڕایەوە.

226- Aristotle, op. cit. 1353-B.

٢٢٧- بەڵام مێرد دەبێت لە دوانزە شتدا ڕەچـاوی میـانڕەوی و ئـەدەب بکـات: لـە خوان-سفرە، پێکەوە ژیان، نوکتەبازی، سیاسەت، ئیرەیـی، خـەرجی، فێرکـردن، سوێند خواردن، تەمبێکردنی، جوتبوون، منالبوون و جیابوونەوە بە تەلاق. احیاء علوم الدین، ب ٢ ل ٤٧.

228- Aristotle, Economics, 1353-B (vol. 2 p. 2147).

229- Ibid

230- Aristotle, Economics, 1353-B (vol. 2 p. 2149).

231- Ibid.

٢٣٢- ناوسکای پاکیزە، شازادەیەکی زۆر جوان بـوو، کچـی ئەلکنیۆسـی پاڵـەوانی پادشای ڤایکییەکانە، یەکەم کەس بوو ئۆلیسی بینی پاش ئەوەی لە کـەنارەکانی ڤیاکی کەشتییەکەی تێکشکا، سەیری ئۆدێسە بکە لە وەرگێڕانی امـین سـلامة ل ١٦٦، بنك الادباء- القاهرة ساڵی ١٩٦٠.

٢٣٣- پاش کەمێك بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم دەستەواژەیە تەواو دروست نییە!

٢٣٤- کریسیسی پاکیزە، کچی پیاوی ئاینیی ئاپۆلۆ بوو، کە ئاگامەمنون بە دیلی گرتی و کردییە بەشێك لە (خێمە شاهانەکەی) بە یەکجاری شەیدای بووبوو، باوکی کچە کە خزمەتکاری پەرستگای ئاپۆلۆ بوو، لە خواوەند پاڕایەوە بەڵکو تۆڵەی کچەکەی بۆ بکاتەوە، ئەویش هەوای لە هێزەکەی ئەگامەمنون بڕی تا ئەو کاتەی کچەکە دەدەنەوە بە باوکی، هەروەها بۆ گێڕانەوەی هەوا مەرجی ئەوەشی دانا کە ئاگامەمنون کچەکەی خۆی (ئەڤیجینیا) بکاتە قوربانی. بەڵام کلیتمنسترا ژنی ئەم پادشایە بوو و دڵسۆزیش نەبوو بۆی.

235- Aristotle, Economics, 1353-B.

٢٣٦- ئەمیان کالیپسۆی خواوەندی نەمر، کچی ئەتلەسە، کە ئۆلیسی لە دورگەکەی خۆیدا بەندکرد و سێکسیشیان پێکەوە کردووە، بۆیە دەڵێم دەستەواژەکەی ئەرەستۆ تەواو دروست نەبوو. ئەو ڕەتی نەکردەوە کە (لەگەڵی بخەوێت) وەك ئەو دەڵێت، بەڵکو ڕەتی کردەوە کە بۆ ئەبەد لای بمێنێتەوە و واز لە دۆزینەوەی ڕێگەی گەڕانەوە بۆ لای هاوسەر و کوڕەکەی بهێنێت، داواکاری ئەو بریتیی بوو لەوەی (لای من بمێنەوە و لە نەمران بە) ئەویش مانەوەی ڕەتکردەوە، هەرچەندە (کە شەو داهات، لە ئەشکەوتێکدا پێکەوە مانەوە، لە تەنیشتیدا دەست لە مل ڕاکشا و شەوێکی پڕ سێکس و چێژیان بە سەر برد). سەیری ئۆدیسە بکە لە وەرگێڕانی امین سلامة ل١٥٣. هەروەها Homer; The Odyssey, book vv, n4, penguin books, p.93-4. trans. By. E.V.Rieu.

٢٣٧- کێرکی خواوەندی جوان، خاوەنی چەندین فێڵ و تەڵەکە، کە ئۆلیس لە سەر کێشییەکانی خۆیدا چاوی پێکەوت و لەگەڵی جەنگا و توانی بیبەزێنێت، ئەویش

داوای کرد واز لە شەڕ بهێنن و بچنەوە بۆماڵەکەی خۆی: (لە سەر خۆ بە، شمشێرەکەت بخە کێلانەکەی و وەرە سەرجێم لەگەڵ بکە، تا ئەگەر پێکەوە لە سەر جێگەکە بە ئەشقەوە ئاوێزان بین، ئەو کات دەتوانین متمانەمان بە یەکتر هەبێت). ئەویش لە وەڵامدا پێی گوت: (بە چی متمانەت پێ بکەم کە ئەگەر وازم لە چەکەکەم هێنا و جلەکانم داکەند، نامکەی بە کەسێکی لاواز و بێ غیرەت؟ نایەمە سەرجێ لەگەڵت تا کاتێك سوێندم بۆ نەخۆی، کە بە هیچ جۆرێك ناپاکیم لەگەڵ نەکەی و هیچ نیازێکی خراپیشت نەبێت).هەرکە خواوەندی جوانیش سوێندی خوارد، ڕۆشت لەگەڵی خەوت. ئۆدێسەی هۆمیرۆس وەرگێڕانە عەرەبییەکەی ل ٢٤٨، وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەشی ل ١٦٤- ١٩٦٥.

238- Aristotle, Economics, vol.2 p. 2149.

٢٣٩- ئۆدێسەی هۆمیرۆس. وەرگێڕانی امین سلامة ل١٧١، بەراوردی بکە بە ئەرەستۆ (الاقتصاد او تدبیر المنزل) کۆی بەرهەمەکانی، ب ٢ ل ٢١٥٠.